


# ● پیاوێکی شەپقەرەشی پاڵتۆرەشی پێڵاوشین

ڕۆمان

**● فەرهاد پیربالْ**



دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی



زنجیرەی ڕۆشنبیری

*

**خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین**

**سەرنووسەر: بەدران ئەحمەد حەبیب**

* * *

ناوونیشان: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، گەڕەکی خانزاد، هەولێر

س. پ. ژمارە: ١

www.araspublisher.com

# پیاوێکی شەپقە رەشی پاڵتۆ رەشی پێڵاو شین

فەرهاد پیربال






**ئەو ناوانەی لەم رۆمانەدا هاتوون، هیچیان پەیوەندییان بەواقیعەوە نییە و خۆم دروستم کردوون**

ناوی کتێب: پیاوێکی شەپقە رەشی پاڵتۆ رەشی پێڵاو شین
رۆمان: د. فەرهاد پیربال
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ١٨٦
دەرهێنانی هونەری:  بەدران ئەحمەد
بەرگ:  ئاراس ئەکرەم
نووسینی سەر بەرگ: محەمەد زادە
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
هەڵەگریی سەر کۆمپیوتەر: عەزیز عەبدولخالق- دلاوەر سادق
سەرپەرشتیی کاری چاپخانە: ئاورەحمان مەحمود
چاپی یەکەم - چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر- ٢٠٠٣
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی رۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (١٥٠)ی ساڵی ٢٠٠٣ی دراوەتێ




## ١

ئەوەتا ئەو کەسەی من بەدوایدا دەگەڕێم:

– چۆنی، کاکە؟

لەوە دەچێ گوێی لێم نەبێ، یانیش نەیەوێت وەڵامم بداتەوە.

ئەگەر (داهاتوو) لەلای ئەو تەنانەت تۆزقاڵێکیش بەها و واتای هەبێت، بێگومان دەبێ ئەوەندە ورە و تاقەتەی هەبێت کە خۆی بهێنێتە سەر ئەو بڕوایەی وەڵامم بداتەوە. سەیرە!

– چۆنی، برام!

ئەم جارە، تەماشایەکی کردم. وەک بڵێی خەواڵوو بێت، دیسان ڕووی کردەوە پەنجەرەکە و وەڵامی نەدامەوە.

ڕۆژیار گەنجێکی تەمەن بیست و حەوت یان بیست و هەشتساڵێک دەبوو، بەژن زراف، سپیکەڵە، موو کەمێک زەرد. دەست و پەنجەکانی دەتگوت دەست و پەنجەی کچێک بوون: ئەوەندە سپی و ناسک بوون. سمێڵێکی سووسنیی بەردابۆوە، لەگەڵ ڕیشێکی تەنک، کە دیاربوو تەنیا دوو هەفتەیەک بوو نەیتراشیبوو.

ڕۆژیار، زۆر بەئاشکرا دیاربوو: کوڕە مـیـرێک بوو. بەڕەسەن، پشتاوپشت دەگەڕایەوە بۆ یەکێک لە میرە شکۆمەندەکانی مەڵبەندی شەمزینان، کە لە ماوەی سەدەی حەوتەم تا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم فەرمانڕەوایەتی شەمزینانیان دەکرد. پاشان لەگەڵ هاتنی عەسکەرە تورکە کەمالییەکان، عەشیرەتی ئەوانیش، ناچار، بنەوبارگەی خۆیان پێچایەوە، دەیان گوند و هەزاران دۆنم عەردی بەیار و سەدان ڕەز و باغاتیان بەجێ هێشت و بەرەو دەشتی هەولێر سەری خۆیان هەڵگرت.[1]

(١) من هەندێک لەم زانیارییانەم لە کتێبە مێژووییەکانەوە کە لەبارەی کورد نووسراون خوێندۆتەوە. ئەو زانیارییانەش کە لەبارەی خودی کەسایەتیی ڕۆژیارەوە دەیانزانم، پێشتر – پێش ئەوەی بچمە لای ڕۆژیار –، لە هاوڕێیەکی خۆمم وەرگرتبوو بە ناوی ئیبراهیم شەمزینی کە کوڕی مامی ڕۆژیار خۆی بوو، باش دەیناسی.



گوتم:

– ببوورە ئەگەر سەغڵەتت دەکەم. دەکرێ تەنیا پرسیارێکت لێ بکەم؟

چەند لقە دارێکی سەوز، گوڵ و گەڵای زۆر جوانیان پێوە شۆڕ ببۆوە. ڕۆژیار چاوی لەسەر لابردن و تەماشایەکی منی کرد. دیسان، خەواڵوو، بێ ئەوەی وەڵامم بداتەوە، ڕووی کردەوە پەنجەرەکە و قەڵماسنگی نیگای خەواڵووی بڕییەوە چیلکە دارەکان.

من لە مالمۆوە تا فلۆرەنسا هەزاران کیلۆمەتر ڕێگەم پەی کردبوو بۆ ئەوەی ڕۆژیار ببینم، کەچی ئەویش بەم شێوەیە پێشوازیی لێ دەکرد: بێ ئەوەی وەڵامم بداتەوە.

گوتم: «کاک ڕۆژیار، من ناوم مامۆستا فەرەیدوونە، خەڵکی شارەکەی خۆتم...».

ڕۆژیار هەر تەماشای لقە دارەکانی ئەودیو پەنجەرەکەی دەکرد، بێ ئەوەی ئاوڕ لە قسەکانم بداتەوە.

من لە مالمۆوە تەنیا یەک جانتای زۆر گەورەم لەگەڵ خۆم هێنابوو. پێش ئەوەی بێمە ناو شوققەکەی ئەو، لەناو هۆڵی شوققەکەیدا بەجێم هێشتبوو. لەناو ژوورەکەی خۆیدا، لەتاو ئەزیەتی وەڵام نەدانەوەی، خەریک بووم توورە دەبووم، دەمویست لە دڵی خۆمدا جنێوێکی پێ بدەم و بچم جانتاکەم هەڵبگرم و بڕۆم، بەڵام پۆژمان بوومەوە. لێی پاڕامەوە:

– کاک ڕۆژیار، تەنیا تۆ دەتوانیت یارمەتیم بدەی...

ڕۆژیار بەهیچ شێوەیەک چاوی لەسەر لقە دارەکانی ئەودیو پەنجەرەکە لانەدەبرد.

من کاتێ لە خوارەوە بووم، پێش ئەوەی بۆ شوققەکەی ئەو سەربکەوم، بەئینگلیزی، لە ژنە دەرگەوانەکەم پرسی:

– کوڕێکی کوردی عیراق لەم ئاپارتمانە دەژی...

ژنە دەرگەوانەکە نەیهێشت قسەکەم تەواو بکەم، بەدڵنیاییەوە پەنجەی بۆ سەرەوە درێژ کرد، گوتی:

– بەڵێ. قاتی دووەم.

کەواتە، من دڵنیا بووم کە ئەمە ڕۆژیار خۆیەتی! تەنانەت هەر بەسیما و ئادگارییەوە دیاربوو کە کوردە.

کە گەیشتمە بەر دەرگای شوققەکەی، لە قاتی دووەم، دەرگاکەی لەسەر پشت، کرابۆوە. سێ جاران لە دەرگام دا، کەس وەڵامی نەدامەوە؛ ئینجا ناچاربووم هێواش هێواش پێ بنێمە ژوورەوە و بێم لە ژوورەکەی خۆیدا بیبینم.

کاتێ قسەی هەندێ لە برادەرەکانی خۆیم بیردەکەوتەوە، ئەمە وای لێ دەکردم هێشتا سەبر بگرم و دان بەخۆمدا بگرم و کەمێکی دیکەش چاوەڕێ بکەم؛ هەوڵی دیکەیشی لەگەڵ بدەم.

ئەو برادەرانەی ڕۆژیاریان دەناسی، دەیانگوت:

– هەرگیز قسە ناکات.

– وەڵامی هیچ کەسێک ناداتەوە.

– هەرگیز دەرگای شوققەکەیشی داناخات..

– تەنانەت دەرگای ژوورەکەیشی.

– شێت بووە ئەوەندەی بەتەنیا بژیت.(٢)

(٢) ئیبراهیم شەمزینی دەیگوت: باوکی ڕۆژیار، شێخ زیلانی مامم، کە لە ئاغا زۆر دیار و دەوڵەمەندەکانی عەشیرەتی خۆمان بوو، لە ساڵی ١٩٧٩ ڕۆژیاری ناردە ئیتاڵیا بۆ ئەوەی لەسەر حسابی خۆی، لە فلۆرەنسا، کۆلێژی ئەندازیاریی بیناسازی تەواو بکات. پاشان کە جەنگی عیراق و ئێران دەستی پێ کرد، وردە وردە دیناری عیراقی شکا: باوکی ڕۆژیار چیتر نەیتوانی پارەی عیراقی بەدۆلار بگۆڕێتەوە و بۆ ڕۆژیاری بنێرێت؛ بەتایبەتیش چونکە لە ساڵی ١٩٨٢، لە سەرەتای جەنگدا، باوکی ڕۆژیار –کە سەرۆک جاش بوو– لە جەنگی دیزفوول، مەیتی گەڕایەوە هەولێر: مەیتی خۆی و کوڕە گەورەکەیشی، عەبدال! ئیتر حکوومەتیش، وردە وردە، دەستی بەسەر موڵک و سامان و زەوی و زارەکانی شێخ زیلان داگرت و تەنانەت لە ڕێگەی سەفارەتخانەی عیراقییەوە لە فلۆرەنسا، سێ چوار جاران داوای لە ڕۆژیاریش کرد «بگەڕێتەوە وڵاتی خۆی: بۆ خزمەتی سەربازی».

ئیبراهیم شەمزینی دەیگوت:

– ڕۆژیار ئەوسا و ئێستاش هەر نەگەڕایەوە هەولێر بۆ خزمەتی سەربازی. پێم وابێ نەشیتوانی خوێندنەکەی خۆی تەواو بکات.






برادەرەکانی ڕۆژیار دەیانگوت:

– ئەوا زیاتر لە یازدە ساڵە، هەر لە پۆلی سێیەمە.

– دەرگای ژوورەکەی، هەمیشە، بەشەو و بەڕۆژ، هەر لەسەر پشتە.

– بیست و چوار سەعات هەر خەوتووە...

من هەرگیز نەمدەتوانی باوەڕ بەقسەی برادەرەکانی ڕۆژیار بکەم. بەخۆمم دەگوت: گەنجێکی کورد لە ئەورووپا چۆن دەکرێ هەمیشە هەر بنوێ؟

## ٢

دەی محەممەد!

ئەوا کاتژمێر دەوروبەری سێی ئێوارەیە؛ لە خەو هەڵسە!

دەی! یەکسەر– هەر لە ناوجێ– جگەرەیەک داگیرسێنە؛ بیربکەوە، با خەیاڵ بتباتەوە... جگەرەیەکی دیکەش داگیرسێنە! ئینجا، لەناو بەتانییەکان وەرە دەرەوە و بڕۆ ئاوێک بەدەمەوچاوت داکە! نانێک (هەمیشە پارچە پەنیرێک و لەتێک سەموون) فراوینت بێ، پاشان ئیتر یەکسەر دەرگاکە لە دوای خۆتەوە بەکلیل داخە و بڕۆ دەرەوە!

بەرەو کوێ؟

بەرەو هەر کوێیەک بێت، گرنگ نییە! گرنگ ئەوەیە ئەم دوو سێ کاتژمێرە لە وەختت بکوژیت، تا کاتژمێر هەشتی ئێوارە: بۆ ئەوەی بگەیتە هوتێل، ئەو هوتێلەی تاقە سەرچاوەیەکی ژیان و بژێوی تۆیە.

Hotel Berghof, 117 Nurmbergstrasse

لە کاتژمێر هەشتی ئێوارەوە، لەو هوتێلە، بەتاقی تەنیا، لە (پێشوازی) دادەنیشیت؛ هەم پاسەوانیت و هەم لە پێشوازی میوانەکاندا.. تا کاتژمێر هەشتی بەیانیی سبەینێ، کاتێ خاوەن هوتێلەکە دێت و ڕۆژنامەیەکی «فۆغن پلاتی» بەدەستەوەیە و پێت دەڵێ:

– گود مۆڕگن، سیروان!

تۆش پێی دەڵێی:







– گود مۆرگن هێر تۆماس.

دەڕۆی...

پێش ئەوەی بڕۆیت و هوتێلەکە بەجێ بێڵێت، باشە؛ نانی بەیانیت لە مووبەقەکەی ئەوێ خواردووە، پێویست ناکا کاتێ دەگەیتەوە ماڵ هیچ گەرم بکەیتەوە و هیچ بخۆی.

هەڵتەک هەڵتەک خۆت دەگەیەنیتە ناو میترۆ.

خەڵک تازە لە خەو هەڵساون و دەچنە سەر کار، کەچی تۆ تازە کار بەجێ دێڵێت و دەچی دەنووی! پەنجا کەس لە دەرگاکانی شەمەندەفەرەکەوە دادەبەزنە خوارەوە و حەفتا کەسی دیکە خۆیانی پیا دەکەن! هەموو ڕۆژێک، هەمان بەزمە، هەمان غارەغار، هەمان قەرەباڵغی، هەمان دەموچاو، هەمان سواربوون، هەمان دابەزین.

هێندە ماندوویت، هێندە بۆرژاوی، هێندە پێویستیت بەخەوە (دەترسیت شەمەندەفەرەکەت تێپەڕ ببێت و گەڕەکەکەت بەجێ بهێڵێ) لە پەنجەرەکەوە هەر چاوەڕێی دەرکەوتنی ناوی گەڕەکەکەت دەکەیت...

لەناکاو گەڕەکەکەی خۆت Kirchatal, Str

لەناو پاڵەپەستۆی قەرەباڵغیی ناو فارگۆنەکەوە، هەرچۆنێک بێت، ڕێگەیەک بۆ خۆت دەکەیتەوە و دەکەویتە سەر شۆستەی ناو میترۆ.. بەرەو ماڵەوە!

کە دەگەیتەوە ژوورەکەت: ئاه.! وەک کێوێک هەرەس بهێنێ! هەندێ جار فریا دەکەویت پێڵاوەکەت دابکەنیت، بەڵام زۆربەی جارانیش هەر بەپێڵاوەوە دەکەویتە ناو جێگەکەت و بەتانیەکە بەخۆت دادەدەیت؛ دەمودەست دەکەویتە ناو خەوێکی قووڵەوە!

تۆ کاتژمێرت نییە، چونکە هیچ پێویستییەکت بەکاتژمێر نییە.. تەنیا ئەوە نەبێ کە کاتژمێر هەشتی ئێوارە بگەیتە هوتێلەکەت! ئەمەش دیارە، زۆر ئاشکرا و ئاسانە: دوای پیاسەیەکی نێوان کاتژمێر چوار تا هەشتی ئێوارە تەماشای یەکێک لە کاتژمێرەکانی سەر ڕێگە یان ئەوەی ناو قاوەخانەکان دەکەیت و بڕیار دەدەی.



تۆ کاتژمێرێکی بایۆلۆژیت هەیە؛ ڕاهاتووی: کاتێ بەیانیان کاتژمێر هەشت و نیوی بەیانی دەگەیتەوە ماڵ و دەنوویت، یەکسەر، بێ ئەوەی هیچ کاتژمێرێک دابنێیتەوە زەنگت بۆ لێ بدا، دەوروبەری کاتژمێر سێی ئێوارە، لە خۆتەوە خەبەرت دەبێتەوە. کاتێ دەوروبەری کاتژمێر چواریش دەگەیتە ناو شەقامەکانی بەرلین، یەکسەر، دوای چەند پیاسەیەک و قاوەخانەیەک و خەیاڵبردنەوەیەک.. دەتوانیت زۆر بەئاسانی بزانیت ئێستا دەوروبەری کاتژمێر چەندە؟

هەندێ جار، کە لەنێوان کاتژمێر سێ تا پێنجی ئێوارە، لە گەڕەکەکەی خۆتان دەچیتە سووپەرمارکێتەکە بۆئەوەی بازاڕێک بکەی یان جلوبەرگت بشۆی (زۆر بەدەگمەنیش جلوبەرگت دەشۆی!)، کاتژمێرە بایۆلۆژییەکەت لێ تێک دەچێ: دەبێ زووتر لە قاوەخانەکە هەڵسیت و زووتر بگەیتە چێشتخانە چینییەکە بۆ نانخواردن (نەوەک لە کاتژمێر هەشت تێپەڕ بکات!).

گەلێک جارانیش، زەوق و تاقەتی پیاسەی دەرەوەی نێوان کاتژمێر چوار تا هەشتت نابێت! چی بکەی! بوو بەچی؟ تاکەی! بڕیار دەدەیت هەر لە ژوورەکەی خۆت بمێنیتەوە. لەسەر کورسیەکەت، ئانشکی ڕاستت لەسەر مێز، جگەرەیەک بەدیار قاوەیەکەوە دادەگیرسێنیت و بیردەکەیتەوە. بێدەنگ، مات، لەسەرخۆ مژ لە جگەرەکەت دەدەیت و جار جار (دەرەنگ دەرەنگ) فرێک لە قاوەکەش دەدەیت: بیردەکەیتەوە. دەنگی تکانی دڵۆپ دڵۆپ ئاوی بەلووعەکە جاڕست دەکا. هەڵدەستی دەچی شێرەی بەلووعەکە توندتر دەبەستیت. دەگەڕێیتەوە سەر هەمان کورسیەکەت، دادەنیشیتەوە. ئینجا لە ناکاو، دەنگی ئحمەئحمی پیاوە پیرە ئەڵمانییەکەی دراوسێت ڕاتدەچڵەکێنێ:

– ئحم.. ئحم..

پاشان ترێک دەکا..

«ئحم. ئحم..» لەگەڵ تڕەکەی، دەنگ دەداتەوە. ئنجا خشەخشی سۆلەکەی، هێواش هێواش، لەگەڵ پێی خۆی ڕایدەکێشێ.

لەو دەمانەدا، کە ناتوانیت بیر بکەیتەوە، دیسان حەزدەکەی بچیت







گۆڤارێک لە گۆڤارە ڕووتەکان بهێنیت و خۆت بەتەماشاکردنی وێنەی ڕووتی ژنە ئەڵمانییەکان مەژغوول بکەیت؛ یان بچیت فیلمێکی سێکسی بخەیتە سەر ڤیدیۆکەت. بەڵام لەو کاتانەدا، زۆربەی جاران، کاتژمێرە بایۆلۆژییەکەت پێت دەڵێ:

– نەخێر. ئەمەیان هەڵبگرە بۆ کاتژمێر دەوروبەری شەشی بەیانی (ئەو کاتانەی بەپێدزکە سەردەکەویت بۆ قاتی دووەم: لە پەنجەرەکەوە، بەدزییەوە، لە فلیمێکی سێکسیی خۆشتر و واقیعی ڕادەمێنیت!).

٣

دوو جاران، بەپشتی پەنجەم، دیسان، توند کێشام بەدەرگای ژوورەکەی. ڕاچڵەکی، بەڵام ئاوڕی لێم نەدایەوە. کەمێک دەنگم لە جارانی پێشوو بەرزتر کردەوە:

– کاک ڕۆژیار، من لە سوێدەوە، بۆ لای تۆ هاتووم!

زۆربەی برادەرەکانی (ئەوانی ڕۆژیاریان دەناسی) دەیانگوت:

«ڕۆژیار، ئەجندە دەستیان لێ وەشاندووە و شێت بووە»

«هەرگیز لە ماڵەوە نایەتە دەرەوە»

«تەنیا بەدیار پەنجەرەکەیەوە دادەنیشێت و بیردەکاتەوە»

«قەتیش دەرگای ژوورەکەی داناخات»

من کاتێ قسەکانی ئیبراهیم شەمزینیی کوڕی مامیم بیردەکەوتەوە و ڕۆژیارم بەم شێوەیە دەدیت، لە دڵی خۆمدا دەمگوت «برادەرەکانی ڕۆژیار ڕاست دەکەن!» «شێتە!» «ئەمە چییە؟»؛ بەڵام لە هەمان کاتدا، بەخۆمم دەگوت «سەبر بگرە! هەندێکی دیکەش چاوەڕێ بکە! ئێستا بەقسەی دەهێنم!».

ڕۆژیار تاکە کەسێک بوو هیوام پێی هەبوو شتێکم پێ بڵێت؛ تاقە ئینسانێک بوو– لە هەموو دنیا– کە چارەنووسی خۆم و ژن و منداڵەکانمی لە چنگدا بوو؛ تەنیا لە ڕێگەی ئەوەوە دەمتوانی بزانم چۆن بەژن و منداڵەکانم شاد دەبمەوە!



پێم گوت: «وەڵامم بدەوە، کاک ڕۆژیار!».

ڕۆژیار هەر بێدەنگ بوو..

لەو دەمەدا، نازانم بۆچی، بۆ یەکەمین جار حەزم کرد چاوێک بەژوورەکەیدا بگێڕم:

ناونوێنێکی شڕوشۆڵی پڕ چەرچەف و بەتانیەی لوول. تەباخێکی دوو چاوەی بێ پێ کە لەسەر عەرزەکە داندرابوو (بە پریشکی ڕۆنی هەڵقرچاو سەرتاپای ڕەش هەڵگەڕابوو) تاوەیەکی زۆر گەورەی ڕەشهەڵگەڕاوی پەڵەپەڵە تیا سووتاو لە تەنیشتیەوە فڕێ درابوو. سەللاجەیەکی زۆر بچکۆڵەش، لە تەنیشتیەوە، پلاکەکەی دەرهێنرابوو. لەسەر عەرزەکەش، لە ناوەندی ژوورەکە، تاکە نەعلێک و سینیەک، قۆریەیەکی چا و پەرداخێکی لەسەر دانرابوو. لە بەردەم کەنتۆرەکەیشی، کاتژمێرێکی گەورەی خڕی لەخەوهەڵسێن (بێ ئەوەی هیچ چرکەچرکێکی لێوە بێت) لەگەڵ پەساپۆرتێک و دەفتەرێکی بچکۆڵەی لاکێشەیی سوور فڕێ درابوون. لەسەر پەساپۆرتەکە نووسرابوو (الجمهورية العراقية.. جواز سفر)، لەسەر دەفتەرە بچکۆلە سوورەکەشی نووسرابوو (الجمهورية العراقية.. شهادة الجنسية العراقية).

تەنیا یەک هەنگاو، زۆر لەسەرخۆ، لێی چوومە پێشەوە:

– کاک ڕۆژیار!

ڕۆژیار دەتگوت بۆ نیگارکێشێک دانیشتووە کە پۆرترێتێکی بۆ بکێشێت، بێدەنگ، لە پەنجەرەکەوە تەماشای لقەدارە بەگوڵ و گەڵا جوانەکانی دەکرد.

من وەک ئەوەی فەرمانبەرێکی زەبوونی بێدەسەڵات بم و لە بەرپێوەبەرەکەم بپاڕێمەوە، گوتم:

– من لە هەولێر، مامۆستای کیمیا بووم. برادەرێکی زۆر نزیکی ئیبراهیم شەمزینیی کوڕی مامت بووم.

پاشان گوتم:

– هەر ئەویش ناونیشانی تۆی بۆ هەڵدام و گوتی «دەتوانی بچیتە




لای».

رۆژیار بەبیستنی ناوی کورە مامەکەی، ئیبراهیم شەمزینی، ئاوڕی نەدایەوە، بەڵام ئێستێکی کرد. من گوتم:

– ئێستا ساڵ و نیوێک زیاترە لە سوێد، لە شاری مالمۆ دەژیم.

رۆژیار هەر وەڵامی نەدامەوە. گوتم:

– لێرە لە تۆ زیاتر کەس ناناسم، کاک رۆژیار!

پاشان درۆیەکم کرد، گوتم:

– ئیبراهیم شەمزینیی کوری مامت سڵاوتی لێ دەکرد، دەیگوت بەرۆژیار بڵێ: «هەر دەبێ یارمەتیت بدات».

رۆژیار، بەو ریشە تەنک و سمێڵە سووسنی و ئادگارە کچانەیەی خۆیەوە، بەراستی لە بەگزادەیەک یان لە پیاوێکی نوورانی دەچوو. زۆر لەسەرخۆ، ئاورێکی لێم دایەوە و سەری بەرزکردەوە، تەماشای ناو چاومی کرد و چرپاندی:

– چیت دەوێ؟

دڵم خۆش داهات: کەوتە قسە! گوتم:

– تەنیا دەمەوێ بزانم محەمەد لە کوێ دەژیت؟

ئەو بێدەنگ مایەوە. ویستم بێدەنگییەکەی بورووژێنم. گوتم:

– محەمەد حەمە رەحیم شوانی.

ئنجا گوتم:

– دەمەوێ ناونیشانی ئەوم بدەیتێ.

پاشان دووپاتم کردەوە: محەمەد حەمە رەحیم شوانی.

رۆژیار بێ ئەوەی تەماشام بکا، گوتی:

– لێرە بوو.

گوتم: دەزانم لێرە بووە. دەشزانم: هاورێی نزیکی تۆ بووە. ئێوە هەر لەو رۆژەوەی گەیشتوونەتە فلۆرەنسا، خانووتان پێکەوە گرتووە و لە یەک شوققەدا پێکەوە ژیاون. لە کۆرسەکانی فێربوونی زمانی ئیتاڵی و تەنانەت لە خوێندنی بەشی ئەندازیاریشدا، لە یەک پۆلدا، پێکەوە بوونە.

رۆژیار تەماشامی دەکرد.



– من دەزانم هاورێیی گیانی بەگیانیی یەکتر بوون. هەر بۆیەش هاتوومەتە لای تۆ.. بۆئەوەی کە تۆ هەواڵ و ناونیشانی ئەوم پێ بڵێیت!

رۆژیار دیسان بێدەنگییەکەی هەڵبژاردەوە. گوتم:

– ئێستا لە کوێیە؟

رۆژیار زۆر بەنەرمی، دەتگوت کچە قسە دەکات:

– حکوومەتی عیراق پارەی لە هەموومان بری.

پاشان زۆر نەرم و لەسەرخۆتر گوتی:

– دەڵێ: «وەرنەوە!».

– کێ دەڵێ «وەرنەوە»؟

– حکوومەت.

من باش ئاگام لە بارودۆخی رۆژیار و محەمەد و ئەو قوتابیانەی تر هەبوو کە لە زانکۆکانی ئیتاڵیا پێش دەستپێکردنی جەنگی عیراق- ئێران دەیانخوێند. لەگەڵ دەستپێکردنی جەنگ، حکوومەتی عیراق پارەناردنی بۆ قوتابییانی زانکۆکانی ئیتاڵیا و وڵاتانی تری ئەورووپا قەدەغە کرد. جگە لەمەش، لە ئەنجامی دابەزینی نرخی دیناری عیراقی، هیچ کەسێک توانای ئەوەی نەما دیناری عیراقی لە هەولێرەوە بنێرێت بۆ کوری خۆی و لەوێ بەخێوی بکات و خوێندنی پێ تەواو بکات. سەرباری هەموو ئەمانەش، حکوومەتی عیراق پەیتا پەیتا داوای لە هەموو ئەو قوتابیانە کرد کە ناوی سەربازییان هاتووە و مەوالیدیان بانگ کراوە، بگەرێنەوە وڵات بۆ بەشداریکردن لە جەنگی قادسیەی صەدام. لەمەوە، ئیتر، قوتابیەکانی زانکۆکانی ئیتاڵیا و پۆڵۆنیا و بولگاریا و یەکیەتیی سۆڤیەت... زۆربەیان دەستیان لە خوێندن هەڵگرت و ناچاربوون بچن لە وڵاتانی وەک سوێد و سویسرا و دانمارک و ئەڵمانیا داوای مافی پەناهەندەیی بکەن!

ویستم لە رۆژیار بپرسم:

– ئەدی باشە، تۆ بۆچی، وەک ئەو هەموو برادەرانەت نەچوویتە وڵاتێکی دیکەی ئەورووپا کە بەپەناهەندە قبووڵت بکا؟

رۆژیار خەریک بوو بکەوێتەوە ناو قۆزاغەی بێدەنگییەکەی پێشووی.





ویستم زوو بێداری بکەمەوە:

– کاک رۆژیار، نازانیت محەمەد چۆتە کام شار؟

– نازانم.

– نازانی لە کام وڵاتە؟

– نازانم.

– ئاخر، تا چەند ساڵێک پێش ئێستا هەر لەگەڵ تۆ، لەم شوققەیەدا بووە.

– وایە.

– ئەدی کە رۆیشت، نەیگوت دەچمە کوێ؟

رۆژیار، ئاورێکی لێم دایەوە:

– محەمەد چیی تۆیە؟

گوتم: ژنبرامە.

لەناو بێدەنگییە درێژخایەنەکەیدا حەزم دەکرد لێی بپارێمەوە و پێی بڵێم:

– لێت دەپارێمەوە، کاک رۆژیار.. ژن و منداڵەکانی من ئێستا لەلای ئەون.

رۆژیار بەدەم تەماشاکردنی لقەدارەکانی ئەودیو پەنجەرەکەوە، زۆر لەسەرخۆ، نەرم نەرم دانی بەسەر وشەکانیدا دەگرت:

– محەمەد خیانەتی لێم کرد..

لێی گەڕام قسەم بۆ بکات. گوتی:

– محەمەد منی لێرە بەتەنیا بەجێ هێشت.

قەیرێک بێدەنگ ما، پاشان گوتی:

– هەرچەند، خۆ من، هیچ منەتم بەئەو نییە.

لە رۆژیارم پرسی:

– کە رۆیشت، نەیگوت «بۆ کوێ دەچم؟».

– دەیگوت «دەچم لە جەزیرەی بوورانۆ لە چێشتخانەیەک کاردەکەم».

– جەزیرەی بوورانۆ لە ئیتالیایە؟

– پاشان، خاوەن چێشتخانەکە.. پەکەکە بوو...



– ئێ؟

– کوشتیان.

– بۆ؟

– ئیدی محەمەدیش ناچار، رووی کردە لایەکی تر.

– رووی کردە کوێ؟

– لە مێژە.

– رووی کردە کوێ؟

– پێش ئەوەی محەمەد بڕوا، ئێمە رۆژێک لەگەڵ یەکتر بەشەڕ هاتین.

– لەسەر چی بەشەڕ هاتن؟

– محەمەد پێمی دەگوت «تۆ هەر دەنووی».

من لە هەموو ژیانمدا، ئەمە یەکەمین جار بوو ببینم پیاوێک هێندە نەرم و لەسەرخۆ بدوێ. پاشان بەئاوازێکی پڕ گلەییەوە، زیاتریش وەک ئەوەی قەشمەری بەمحەمەد بکا، زەردەخەنەیەک کەوتە سەر لێوی:

– خۆ ئەو بۆ خۆیشی، لێرە، هەر دەنوست.

ئنجا رووی کردەوە لقەدارەکانی بەرپەنجەرەکە:

– ئەو عەلاقەی چییە کە من هەر بنووم؟

هەستم دەکرد رۆژیار دەزانێ محەمەد چووە بۆ کام وڵات، بەڵام پێم ناڵێ، گوتم:

– تکات لێ دەکەم، کاک رۆژیار، پێم بڵێ: محەمەد چووە بۆ کام شار، بۆ کام وڵات؟

رۆژیار بەرامبەرم، ئەم جارە پشتی تێ کردبووم، رووی لە پەنجەرە، متەقی لێوە نەدەهات. گوتم:

– کاک رۆژیار، من لە سوێدەوە هاتووم بۆ لای تۆ، بۆ ئەوەی محەمەدی هاورێت ببینم؛ محەمەدی ژنبرام ببینم.

رۆژیار، لە ناو بێجامە خەتخەتەکەی خۆیدا، تۆزقاڵێک چییە نەدەجووڵا. گوتم:

– کاک رۆژیار لێت دەپارێمەوە؛ چارەنووسی ژنەکەم و منداڵەکانم، داهاتووی خێزانێک بەتۆوە بەندە. ئەگەر دەزانی محەمەدی ژنبرام چووە بۆ




کوێ، لێت دەپاڕێمەوە: پێم بڵێ!

ڕۆژیار ڕووی وەرسووڕاندەوە، زۆر بەهێمنی و لەسەرەخۆ (دیاربوو مێشکی لەلایەکی دیکە بوو) گوتی:

– نازانم.

گوتم: باشە، ئاگات لێ نییە: ژنێک و دوو منداڵ بێنە لای ئەو؟

چاوەکانی پرسیاریان دەکرد. وەڵامم دایەوە:

– ژنەکەی من، کە دەکاتە خوشکی ئەو، لەگەڵ دوو منداڵەکەمان.. لەگەڵ ئەوت نەدیون؟

سەری نەزانینی ڕاتەکاند.

لێم پرسی:

– نازانیت هاتوون بۆ لای ئەو یان نا؟

– نا....

– یەعنی، نەتدیوە ژنێک و دوو منداڵ بێنە لای ئەو؟

– نا.

من تەنیا لەم ئان و ساتەدا بۆم دەرکەوت کە ڕۆژیار هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ «نەخۆشێکی شێتخانە» نەبوو. بەتایبەتیش لە کۆتاییدا کاتێ بینیم: هێواش هێواش، بەوپەڕی بێباکی و بێدەنگییەکەی خۆیەوە، چووە ناو نوێنەکەی خۆی و بەتانییەکەی بەخۆی دادا و ڕووی لە دیوار کرد، گوتی:

– من خەوم دێ.

## ٤

دەی محەممەد!

دیسان ئەوا کاتژمێر دەوروبەری سێی ئێوارەیە؛ لە خەو هەڵسە!

دەی! یەکسەر– هەر لە ناو جێ– جگەرەیەک داگیرسێنە؛ بیربکەوە، با خەیاڵ بتباتەوە... جگەرەیەکی دیکەش داگیرسێنە! ئینجا، لەناو بەتانییەکان وەرە دەرەوە و برۆ ئاوێک بەدەموچاوت داکە؛ نانێک (هەمیشە پارچە پەنیرێک و لەتێک سەموون) فراوینت بێ، پاشان ئیتر



یەکسەر دەرگاکە لە دوای خۆتەوە بەکلیل داخە و برۆ دەرەوە!

بەرەو کوێ؟

بەرەو هەر کوێیەک بێت، گرنگ نییە! گرنگ ئەوەیە ئەم دوو سێ کاتژمێرە دیسان لە وەختت بکوژیت، تا کاتژمێر هەشتی ئێوارە: بۆ ئەوەی بگەیتە هوتێل، ئەو هوتێلەی تاقە سەرچاوەیەکی ژیان و بژیوی تۆیە.

Hotel Berghof, 117 Nurmbergstrasse

ئەمڕۆش دیسان لە کاتژمێر هەشتی ئێوارەوە، لەو هوتێلە، بەتاقی تەنیا، لە (پێشوازی) دادەنیشیت؛ هەم پاسەوانیت و هەم لە پێشوازی میوانەکاندا، تا کاتژمێر هەشتی بەیانیی سبەینێ، کاتێ خاوەن هوتێلەکە دێت و ڕۆژنامەیەکی «فۆغن پلاتی» بەدەستەوەیە و دیسان پێت دەڵێ:

– گود مۆرگن، سیروان!

تۆش پێی دەڵێی:

– گود مۆرگن هێر تۆماس.

دەڕۆی...

پێش ئەوەی بڕۆیت و هوتێلەکە بەجێ بێڵیت، باشە؛ نانی بەیانیت لە مووبەقەکەی ئەوێ خواردووە، پێویست ناکا کاتێ دەگەیتەوە ماڵ هیچ گەرم بکەیتەوە و هیچ بخۆی.

دیسانەوە هەڵتەک هەڵتەک خۆت دەگەیەنیتە ناو میترۆ.

خەڵک تازە لە خەو هەڵساون و دەچنە سەر کار، کەچی تۆ تازە کار بەجێ دێڵیت و دەچی دەنووی! دیسان وەک دوێنێ و پێرێ و بەستریپێرێ... پەنجا کەس لە دەرگاکانی شەمەندەفەرەکەوە دادەبەزنە خوارەوە و حەفتا کەسی دیکە خۆیان پیا دەکەن! هەموو ڕۆژێک، هەمان بەزمە، هەمان غارەغار، هەمان قەرەباڵغی، هەمان دەموچاو، هەمان سواربوون، هەمان دابەزین.

هێندە ماندوویت، هێندە بۆرژاوی، هێندە پێویستیت بەخەوە (دەترسیت شەمەندەفەرەکەت تێپەڕ ببێت و گەڕەکەکەت بەجێ بهێڵێ) لە پەنجەرەکەوە هەر چاوەڕێی دەرکەوتنی ناوی گەڕەکەکەت دەکەیت...






لە ناکاو گەڕەکەکەت Kirchatal, Str

لەناو پاڵەپەستۆی قەرەباڵغیی ناو فارگۆنەکەوە، هەرچۆنێک بێت، ڕێگەیەک بۆ خۆت دەکەیتەوە و دەکەویتە سەر شۆستەی ناو میترۆکە.. بەرەو ماڵەوە!

کە دەگەیتەوە ژوورەکەت: ئاه.! وەک کێوێک هەرەس بهێنێ! هەندێ جار فریا دەکەویت پێڵاوەکەت دابکەنیت، بەڵام زۆربەی جارانیش هەر بەپێڵاوەوە دەکەویتە ناو جێگەکەت و بەتانیەکە بەخۆت دادەدەیت؛ دەمودەست دەکەویتە ناو خەوێکی قووڵەوە!

تۆ کاتژمێرت نییە، چونکە هیچ پێویستییەکت بەکاتژمێر نییە.. تەنیا ئەوە نەبێ کە کاتژمێر هەشتی ئێوارە بگەیتە هوتێلەکەت! ئەمەش دیارە، زۆر ئاشکراو ئاسانە: دوای پیاسەیەکی نێوان کاتژمێر چوار تا هەشتی ئێوارە تەماشای یەکێک لە کاتژمێرەکانی سەر ڕێگە یان ئەوەی ناو قاوەخانەکان دەکەیت و بڕیار دەدەی.

تۆ کاتژمێرێکی بایۆلۆژیت هەیە؛ ڕاهاتووی: کاتێ بەیانیان کاتژمێر هەشت و نیوی بەیانی دەگەیتەوە ماڵ و دەنوویت، یەکسەر، بێ ئەوەی هیچ کاتژمێرێک دابنێیتەوە زەنگت بۆ لێ بدا، دەوروبەری کاتژمێر سێی ئێوارە، لە خۆتەوە خەبەرت دەبێتەوە. کاتێ دەوروبەری کاتژمێر چواریش دەگەیتە ناو شەقامەکانی بەرلین، یەکسەر، دوای چەند پیاسەیەک و قاوەخانەیەک و خەیاڵبردنەوەیەک.. دەتوانیت زۆر بەئاسانی بزانیت ئێستا دەوروبەری کاتژمێر چەندە؟!

هەندێ جار، کە لەنێوان کاتژمێر سێ تا پێنجی ئێوارە، لە گەڕەکەکەی خۆتان دەچیتە سووپەرمارکێتەکە بۆئەوەی بازاڕێک بکەی یان جلوبەرگت بشۆی (زۆر بەدەگمەنیش جلوبەرگت دەشۆی!)، کاتژمێرە بایۆلۆژییەکەت لێ تێک دەچێ: دەبێ زووتر لە قاوەخانەکە هەڵسیت و زووتر بگەیتە چێشتخانە چینییەکە بۆ نانخواردن (نەوەک لە کاتژمێر هەشت تێپەڕ بکات!).

گەلێک جارانیش، زەوق و تاقەتی پیاسەی دەرەوەی نێوان کاتژمێر چوار تا هەشتت نابێت! چی بکەی! بوو بەچی؟ تاکەی! بڕیار دەدەیت هەر لە



ژوورەکەی خۆت بمێنیتەوە. لەسەر کورسیەکەت، ئانشکی ڕاستت لەسەر مێز، جگەرەیەک بەدیار قاوەیەکەوە دادەگیرسێنیت و بیردەکەیتەوە. بێدەنگ، مات، لەسەرخۆ مژ لە جگەرەکەت دەدەیت و جار جار (دەرەنگ دەرەنگ) فرێک لە قاوەکەش دەدەیت: بیردەکەیتەوە.

دیسان دەنگی تکانی دڵۆپ دڵۆپ ئاوی بەلوعەکە جاڕست دەکا. هەڵدەستیت دەچی شێرەی بەلوعەکە توندتر دەبەستیت. دەگەڕێیتەوە سەر هەمان کورسیەکەت و دادەنیشیتەوە. ئینجا لە ناکاو، دیسان، دەنگی ئحمەئحمی پیاوە پیرە ئەڵمانییەکەی دراوسێت، ڕاتدەچڵەکێنێ:

– ئحم. ئحم..

پاشان ترێک..

«ئحم. ئحم..» لەگەڵ تڕەکەی دەنگ دەداتەوە. ئنجا خشەخشی سۆلەکەی، هێواش هێواش، لەگەڵ پێی خۆی ڕایدەکێشێ.

لەو دەمانەدا، کە ناتوانیت بیر بکەیتەوە، دیسان حەزدەکەی بچیت گۆڤارێک لە گۆڤارە ڕووتەکان بهێنیت و خۆت بەتەماشاکردنی وێنەی ڕووتی ژنە ئەڵمانییەکان مەژغوول بکەیت؛ یان بچیت فیلمێکی سێکسی بخەیتە سەر ڤیدیۆکەت. بەڵام لەو کاتانەدا، زۆربەی جاران، کاتژمێرە بایۆلۆژییەکەت پێت دەڵێ:

– نەخێر. ئەمەیان هەڵبگرە بۆ کاتژمێر دەوروبەری شەشی بەیانی (ئەو کاتانەی بەپێدزکە سەردەکەویت بۆ قاتی دووەم: لە پەنجەرەکەوە، بەدزییەوە، لە فلیمێکی سێکسیی خۆشتر و واقیعی ڕادەمێنیت!).

## ٥

من لە کاتژمێر نۆ و نیوی سپێدەی ڕۆژی ١٦ی مانگی نیسان گەیشتمە پاریس. مامۆستایەکی فەقیرحاڵی دەرسی کیمیا، ئەگەرچی ساڵ ونیوێک زیاترە لە سوێد دەژیم، بەڵام لە پاریس کێ دەناسم، کێ دەمناسێ؟

هەر لە فڕۆکەخانەوە تەکسییەکم گرت و بەئینگلیزییە شڕەکەی خۆم بەشوفێرەکەم گوت:

– بمبە هوتێلێکی هەرزانی نزیک ئەم ناونیشانە!

ناونیشانەکەم لەسەر لاپەڕەیەکی گەورەی سپی، بەئاشکرایی نووسیبوو.

شوفێر ناونیشانە فەرەنسییەکەی خوێندەوە، گوتی:

– پاریسی دەیەم، ١٤٣ شەقامی لافایەت، قاتی سێیەم. باش.

لە خۆمەوە (لە حەژمەت تەنیایی و بێکەسیی خۆم) دەمویست دەردی دڵی خۆم لای شوفێری تەکسییەکە هەڵبڕێژم. هێندەی نەمابوو لەناکاو بەشوفێرەکە بڵێم:

– من کوردم، برای بەڕێز!

ئنجا دەست بکەمە قسە و پێی بڵێم:

– ساڵ و نیوێک زیاترە لە سوێد بەپەناهەندەیی دەژیم. ساڵ و نیوێک زیاترە هەرچی پارەیەکی پێم کراوە پاشەکەوتی بکەم و لە دەمی خۆمی بگرمەوە، تەرخانم کرد بۆ ئەوەی ژن و منداڵەکانی لە کوردستانەوە بۆ سوێد پێ دەرباز بکەم. ساڵ و نیوێک زیاترە هەر چاوەڕێیان دەکەم بەڵکو بتوانن بەرەو لای من دەربازیان ببێت. ساڵ و نیوێک زیاترە هەر ناو میترۆ و ناو گۆڕستانەکان پاک دەکەمەوە بۆ ئەوەی پارەیەکی زیاترم دەست بکەوێت و، لە پێناو گەیشتنیان بۆ لای خۆم ناچار نەبم دەست لە ئەم و ئەو پان بکەمەوە.

ئەگەر ئەم هەموو قسەیەم، بەسەر یەکەوە، لەناکاو بەشوفێرەکە گوتبایە، بێگومان سەری سوڕدەما و ئاوڕێکی دواوەی بۆ لای من دەدایەوە و دەیگوت:

– ئێ؟ ئنجا ئێستا تۆ چیت لێ قەوماوە، کاکە؟

منیش تەنگەتاو دەمگوت:

– ژنەکەم و دوو منداڵەکەم..

– چییانە..؟

– دوو مانگ زیاترە هەولێریان بەجێ هێشتووە و بەگەڵ قاچاغچیان کەوتوون.. بەهیوای ئەوەی بگەنە لای من.

ئەم ئەورووپییانە، بێگومان، سەریان لەم جۆرە کارانە سوڕدەمێنێ!



مرۆڤ چۆن دڵی دێ و چاوی بەرایی دەدا ژنەکەی خۆی و دوو منداڵی خۆی بسپێرێتە دەست قاچاغچیان؟

– خەزوورەکەم ئەم نەخشەیەی بۆ دانابووین.

– نەدەبووایە...

– خەزوورەکەم بەتەلەفۆن هەمیشە پێی دەگوتم: «قاچاغچییەکان خزم و ناسیاوی خۆمانن، تا نەیانگەیەننە دەست خۆت لە شاری مالمۆ، بەرەڵایان ناکەن! مەترسە!». کەچی ئەوەتا، ئەوا دوو هەفتە زیاترە ئەستەمبۆڵیان بەجێ هێشتووە و هەر نەگەیشتوونەتە لای من! وەختە شێت ببم. نازانم چی بکەم! مردم هێندەی سۆراغیان بکەم. هەرچی پارە و پوولی پاشەکەوتم کردبوون، هەمووم دایە تەلەفۆن بۆ ئەم وڵات و ئەو وڵات.

شوفێری تەکسیەکە، لە ئاوێنەکەوە تەماشامی دەکرد. بەزمانی عەرەبی لێمی پرسی:

– جەنابت خەڵکی سووریایت؟

زۆر کەیفم هات کە شوفێرەکە بەعەرەبی پرسیاری لێ کردم.

گوتم: نەخێر، کوردی عیراقم.

– پێخۆشحاڵم.

یەکسەر لێم پرسی: تۆ چەند ساڵە لە فەرەنسایت؟

– من خەڵکی مووسڵم. دوازدە ساڵە لە پاریسم.

لەو دەمەدا نازانم بۆچی: بێ ئەوەی بەهیچ شێوەیەک بتوانم گومان لەو شوفێرە بکەم یان لێی بسڵەمێمەوە، هەرچی دەردی دڵی خۆم هەبوو لای ئەوم هەڵڕشت، چیرۆکی ژیانی خۆم و خێزانەکەم لە نووکەوە بۆی گێڕایەوە. باسی ئەوەم بۆی کرد کە چۆن ژنەکەم و دوو منداڵەکەم، دوو هەفتە زیاترە لە ئەستەمبۆڵەوە بەرەو ئیتالیا بەڕێ کەوتوون؛ وە چۆن هەر جارێکی لە شاری مالمۆوە تەلەفۆنم بۆ ماڵە خەزوورەکەم لە هەولێر کردووە، خەزوورەکەم هەر گوتوویەتی «قاچاغچییەکان گەڕاونەتەوە هەولێر و دەڵێن: ژن و دوو منداڵەکەیان سپاردۆتە دەست محەمەدی ژنبراکەی خۆی لە فلۆرەنسا».

هەروەها ئەوەشم بۆ شوفێرەکە باس کرد کە من ئێستا هەر ئەمڕۆ لە

ئیتاڵیاوە دەگەمە ئێرە؛ هەموو ئیتاڵیام تەی کردووە و بەدوای مەحەمەدی ژنبرام گەڕاوم و نەمدۆزیوەتەوە؛ تەنانەت ئەوەشم بۆی باس کرد کە چۆن ئێستا تەنیا سێ هەزار کرۆنێکی سوێدیم لەلا ماوە، ئەم سێ هەزار کرۆنەش هەر بەشی ئێرە و ئوتێل و بلیتی فڕۆکەم دەکات و.. ئیتر.. کە دەگەمەوە مالمۆ دەبێ یەکسەر بکەومەوە قەرزوقۆڵ.

من لەو دەمەیدا کە غەمی ئەوەم بوو ئاخۆ (کە دەگەڕێمەوە مالمۆ) تۆ بڵێی کەسێک پەیدا بکەم هەندێک پارەم بەقەرز بداتێ.. شوفێری تەکسیەکە لێمی پرسی:

– باشە، ئەدی ئێستا تۆ بۆچی هاتووی بۆ پاریس؟ لە پاریس چ دەکەی؟

– لەوە دەچێ ژنبراکەم هاتبێتە پاریس...

پاشان گوتم:

– ئەم ناونیشانەی پاریس.. تاقە هیوایەکی ژیانمە! دواین ئومێدمە کە بتوانێ هەواڵێکی ژن و منداڵەکانم بداتێ.

شوفێرەکە گوتی:

– کێت لەوێ هەیە؟

گوتم:

– ڕاستییەکەی، من نایناسم؛ بەڵام برادەرێکی ژنبراکەمە.

– کێ؟

– ئەو کەسەی کە ئێستا دەچم دەیبینم.

– کێیە؟

– کاتی خۆی پێکەوە لەگەڵ ژنبراکەم لە زانکۆی فلۆرەنسا لە ئیتاڵیا قوتابیی بەشی ئەندازیاریی بیناسازی بوونە.

شوفێرەکە لە ئاوێنەکەوە تەماشامی دەکرد و بەسەر دڵنیامی دەکردەوە. گوتم:

– ئیتر، ئێستا ئەم برادەرە هەواڵ و ناونیشانی ئەو دەزانێ!

شوفێرەکە، نازانم بۆچی، لێمی پرسی:

– خەزوورت دەڵێ کە ژن و دوو منداڵەکەت گەیشتوونەتە لای







ژنبراکەت؟

– بەڵێ.

– لە ئیتاڵیا؟

– بەڵێ. ئیتر.. بەپێی قسەی قاچاغچییەکان.

شوفێرەکە دیاربوو دەیویست باش لە چیرۆکەکەم حاڵی ببێت. وابزانم دەیویست لێم بپرسێت «ئەدی کەواتە بۆچی لە پاریس بەدوایاندا دەگەڕێی؟» بەڵام لە کۆتاییدا، دوای بێدەنگییەکی پڕ بیرکردنەوە، لێمی پرسی:

– تۆ ناشزانیت ژنبراکەت لە کام وڵاتە؟

گوتم:

– پێشتر لە ئیتاڵیا بووە.

شوفێرەکە هەر بیری دەکردەوە، گوتی:

– ئەدی ئێستا؟

من تەنگەتاوی ئەوە بووم زووتر بگەم، نەختێک نائومێدانە دەنگم هەڵبڕی:

– ئەوە نییە... بەدوایدا دەگەڕێم!

٦

جمهورية العراق

وزارة الداخلية

مديرية الجنسية والاحوال المدنية العامة

البطاقة الشخصية

صادرة بموجب قانون الاحوال المدنية رقم ٦٥ لسنة- ١٩٧٢ المعدل

الدائرة: كركوك

السجل: ٩٦٨٥

الصحيفة: ٣

رقم الهوية: ٤١٥٥١٧

الاسم: محمد

اسم الاب والجد: حمه رحيم

اللقب: شواني

اسم الام و الجد: گولناز حسين

الجنس: ذكر

تاريخ التنظيم: ١٩٧٣/٨/٢٤

تەماشایەکی دیوەکەی تریشت کرد:

المهنة: ـــ

الديانة او المعتقد: مسلم

تاريخ الولادة رقما: ١٩٦١/٨/٢٠

كتابة: تسعمائة و واحد وسبعون

محل الولادة: كركوك/ شوريجة

العاهات الظاهرة: سالم

الحالة الزوجية: اعزب

اسم الزوج: ـــ

محل التسجيل: رحيماوا

الاوصاف

لون العين: نرجس

لون الوجه: حنطي

لون الشعر: اسود

ناسنامەی «ئەحواڵ مەدەنییەکەت» فڕێ دایەوە سەر سیسەمەکەت، بەڵام چاوت هەر لەسەر وێنەکەی خۆت بوو. پۆلیسی ئەڵمانی ئەگەر ئەم ناسنامەیەی تۆی بەرچنگ بکەوێ، چیت لێ دەکا ؟ دایەرەی پەناهەندانی ئەڵمانیا ، ئەگەر بزانن تۆ ناوی خۆت گۆڕیوە و بەناوێکی تازەوە، بەبەڵگەنامەی ترەوە خۆت لە لایان ناونووس کردووە؛ چیت لێدەکەن؟ بێگومان دەمودەست کارتی پەناهەندەییت لە ئەڵمانیا ،





بەپەساپۆرتەکەشتەوە، لێ دەسەننەوە و تەنانەت لەوانەیە بتخەنە بەندیخانەشەوە!

خەتای خۆت بوو! هەر لە سەرەتاوە، نەچووی ڕاستگۆیانە پێیان بڵێی:

- من تاکو ساڵی ١٩٨٣ لە ئیتاڵیا، لەسەر حسابی خۆم، لە بەشی ئەندازیاریی بیناسازی، لە زانکۆی فلۆرەنسا قوتابی بووم.. پاشان حکوومەتی عیراق چیتر ڕێگەی نەدا لە وڵاتی خۆمانەوە پارەمان بۆ بنێرن، داواشی لێکردین بگەڕێینەوە بۆ «خزمەتی سەربازی» و بچینە جەنگ. ئیتر بۆیە ژیانم لە فلۆرەنسا وردە وردە کەوتە ژێر هەڕەشە و مەترسییەوە: مەترسیی هەڕەشە لێکردنم لە لایەن سەفارەتخانەی عیراقییەوە لە فلۆرەنسا ، لە لایەکی دیکەشەوە مەترسیی ئەوەی کە خەریک بوو لە بێ پارەیی و لە برسان دەمردم. دەبوایە کارێک بدۆزمەوە پێی بژیم، وڵاتێک بدۆزمەوە داڵدەم بدا. بۆیە دوای ئەو هەموو ساڵە تەحەممول کردن لە ئیتاڵیا ، ناچاربووم بێمە وڵاتەکەی ئێوە: ئەڵمانیا!

چووی ناسنامەیەکی دەسهەڵبەست و ڕەگەزنامەیەکی عیراقیی ساختەت دروست کرد و ناوت لە خۆت نا «سیروان حیکمەت بابان». گوتت:

- من سێ ساڵان لە بەندیخانەی (ئەبوو غرێب) زندان کرابووم، لەسەر ئەوەی کە لە سەرژمێرییەکەی ساڵی ١٩٨٣ لە کەرکووک خۆم بە«کورد» ناونووس کردبوو؛ تۆمەتی «کاری سیاسیی دژ بەحکوومەتی بەعسییان» دابووە پاڵم. بۆیە ناچاربووم بەڕێگەی ئێرانەوە خۆم بگەیەنمە پۆڵۆنیا و لە سنووری پۆڵۆنیاوە بێمە ناو خاکی ئەڵمانیاوە.

ئۆف!

ئەم هەموو درۆ و دەلەسە و غارە غارە!

ئەم هەموو مەتبەخ بەکۆڵی و زەبوونی و دەردەسەرییە!

ئەم هەموو ماندووبوونەی ئەم هەموو ساڵانە؛ لە پێناو چی؟

لە پێناو ئەوەی کە بێم شەو تا بەیانی لە هوتێلێک، شەونخوون، ببمە پاسەوان!

لە کاتژمێر هەشتی ئێوارەوە تا هەشتی بەیانی، لە پێشوازیی

هوتێلێکدا، وەک سەنەم، دانیشم تەماشای ئەو گەڕیدە و ڕێبوارانە بکەم کە میوانی هوتێلەکەن و هەموو شەوێک، هەمان ریتم، هەمان شت: دێنە ژوورەوە، دەچنە دەرەوە؛ دەچنە دەرەوە، دێنە ژوورەوە. دەچنە سەرەوە، دێنە خوارەوە؛ دێنە خوارەوە، دەچنە سەرەوە...

بەڵێ. ژیانی تۆ، ئەوەیە ئیتر. هەموو گەڕاڵ و میوانەکانی ئەم هوتێلە، بەشەوان بۆ خۆیان دەگەڕێنەوە دەنوون؛ تەنیا تۆ نەبێ... نابێ بنووی!

هەموو بەرلین، هەموو ئەڵمانیاش بنوێ؛ تۆ نابێ بنوویت! تۆ پاسەوانی ئەم هوتێلەیت، تۆ لە پێشوازیی ئەم هوتێلەدایت. لە کاتژمێر هەشتی ئێوارەوە تا هەشتی بەیانی، لەم هوتێلە، هەرچی ڕووبدات و بکرێ، هەرچی بدزرێ، هەرچی بشکێ، بسووتێ.. تۆ بەرپرسیاریت!

چی بکەیت؟ تۆ ئەمە چەندین ساڵە، چەند بیری لێ دەکەیتەوە؛ لەم کارە زیاتر تاقەت و هێزی هیچ ئیشێکی دیکەت نییە. (ئارام) لە دەزگایەکی بەستنی هێڵی کارەبا ئیش دەکات؛ تۆ لێی نازانیت. (سەرگەڤاز) لە چێشتخانەیەکی تورکەکان قاپ و قاچاغ دەشوا؛ تۆ پێت عەیبە ئەم کارە بکەیت. (نەژدەت) لەگەڵ ستافێکی دروستکردنی بینا کرێکارێتی دەکا؛ تۆ هێزی ئەوەت نییە. پاشان، دکتۆر سەردار، بەشەهادەی دکتۆرای خۆیشیەوە، لێرە دانیشتووە دوکانێکی مۆتەفرۆشیی کردۆتەوە و مۆتە دەفرۆشێ! هەر چۆنێک بێ، تۆ ئیتر هەر لەو ڕۆژەوەی ناوی خوات لێ هێنا کارێک بکەی، ئەم هوتێلەت دۆزییەوە. لە هەموو کارێک ئاسانتر و کەم ئەزیەتترە، بەڵام- ئەمە بووە چەند ساڵ؟ یازدە ساڵ زیاترە- مردی، شێت بووی هێندەی ڕۆژەکان و شەوەکان و هەفتەکان و مانگەکان و ساڵەکان.. هەر دووبارە و دووبارە بکەیتەوە. بەتەواوەتی بێزار بووی هێندەی ژیانت تەنیا کاتژمێر چواری ئێوارە تا هەشتی ئێوارە بێت!

تەنیا چواری ئێوارە تا هەشتی ئێوارە. ئەمەیە ژیانی تۆ!

تۆ.. حەیف، وا یازدە ساڵ زیاترە ژیانت تەنیا لە چواری ئێوارەوە دەست پێ دەکات تا هەشتی ئێوارە. وا یازدە ساڵ زیاترە نازانیت سپێدە لە دەرەوە چ ڕەنگێکی هەیە! نازانیت وەخەبەرهاتنەوەی بەیانییان واتە چی؟ یازدە ساڵ زیاترە نازانیت نانخواردنی نیوەڕۆ چ تامێکی هەیە! یازدە ساڵ



زیاترە نازانیت ئێوارە، کاتێ خۆر لەودیو کەژ و ئاپارتمانەکانەوە وردە وردە دادەبەزێتە خوارەوە، چ جوانی و واتایەکی هەیە! یازدە ساڵ زیاترە نازانیت شەو، ئەو قەرەباڵغییە بۆنداره زێڕەوشانە پڕ هەرا ڕندانەی سەر شەقامەکان، چ پڕشنگ و جوانییەکی ئەفسووناویی هەیە! ئایا ئەمەیە ئەورووپا؟ ئایا ئەورووپا هەر ئەم نوستنە بەردەوامە و هەر ئەم مردنە بێدارەیە کە تۆ دەیبینیت؟ نەخێر، بەڵام تۆ تازە ڕاهاتووی. بەوە ڕاهاتووی کە ئاوها بژیت. تۆ بەنائومێدی و بەدبەختییەکانی ژیانی پەناهەندەیی خۆت تازە ڕاهاتووی. تۆ کە دەقت بەژیانێکەوە گرت، ئیتر واتێدەگەی ژیان ئەمەیە ئیتر. تۆ تا ئەوکاتەی نەچیت بەشێوەیەکی دیکە بژیت، هەرگیز ناتوانی لەوە تێبگەیت کە تۆ چەنێک کۆیلە و چەنێک بەدبەختیت!

چواری ئێوارە تا هەشتی ئێوارە. ئەمەیە ژیانی تۆ! تەنیا چوار کاتژمێر! دوو سەعاتیش بۆ میترۆ و پاص و نانخواردن! کەواتە ژیانی تۆ، ژیانی تایبەت بەخودی خۆت: تەنیا دوو سەعاتی لێ دەمێنێتەوە. ژیانی تۆ تەنیا دوو سەعاتە! تەنیا دوو سەعات! لەگەڵ ڕۆژانی یەکشەممەی بێتاقەتی و تەنیاییت.. ڕۆژانی یەکشەممەی لە هەموو ڕۆژێک ناخۆشتر و ئێسک گرانتر!

ئۆف!

ئەم هەموو درۆ و دەلەسە و غارە غارە، ئەم هەموو ماندووبوونەی ئەم هەموو ساڵانەت، ئەم هەموو سنوور بڕینە بێهوودەیەت، ئەم هەموو وڵاتە و وڵات کردنەت، ئەم هەموو دایەرەی پۆلیس و پەناهەندەیی و تەندروستی و بەلەدیە و تەحقیق و تەحقیقکارییە... لە پێناو چی؟ لە پێناو چی؟ تۆ ئەمە سەدان جارە ئەم پرسیارە لە خۆت دەکەیت، هیچ چارەسەر و بڕیارێکیشت نییە. بێهوودەیە. ناگەیتە هیچ. چارەت نییە. هەیت. کە هەیت، دەبێ بژیت! ژیانیشت هەر تەنیا ئەم دوو سەعاتەی نێوان کاتژمێر چوار تا هەشتی ئێوارەیە.

دیسان دەنگی تکانی دڵۆپ دڵۆپ ئاوی بەلووعەکە جاڕسی کردیت، هەڵسایت، چووی شێرەی بەلووعەکەت توندتر بەست. گەڕایتەوە سەر هەمان کورسیەکەت و جگەرەیەکی دیکەت داگیرساند. لە ناکاو، دیسان






دەنگی (ئحمە ئحمی) پیاوە پیرە ئەڵمانییەکەی دراوسێت سەرودڵتی تێک دایەوە:

– ئحم.. ئححمم...

پاشان ترپێک..

دەنگی ئحمەئحمی پیاوەکە، لەگەڵ دەنگی ترەکەی، لە ژوورەکەی تۆشدا دەنگی دایەوە. ئنجا خشەخشی سۆلەکەی هات، هێواش هێواش، لەگەڵ پێی خۆی رایدەکێشا.

«دە هەڵسە، دەی،
محەمەد؛ هەڵسە!». کاتژمێرە بایۆلۆژییەکەت وات پێ دەڵێ.
هەڵسە! ژمارە ١١٧ شەقامی نوورمبێرگ شتراسە
Nurmberg strasse
هوتێلی بێرگۆف Berghof بانگت دەکا! هەڵسە!

## ٧

– سوپاست دەکەم.

پارەی کرێی تەکسیەکەم نەدایە شوفێرەکە، چونکە گفتی پێدابووم: چارەگە سەعاتێک لەسەرم بوەستێت تا ئەوکاتەی هەواڵ و ناونیشانی محەمەدی ژنبرام «لەو برادەرە» وەربگرم و پاشان دەمودەست بمگەیەنێتەوە فرۆکەخانەی (شارڵ دوگۆڵ).. یانیش ئیتر لەوێ بتوانم بریارێک بدەم.

جانتا گەورەکەمم هەر لەناو تەکسیەکەی بەجێ هێشت و بەپەلە دابەزیم:

– هەر ئێستا دەگەڕێمەوە.

– ئەم ئاپارتمانە دوودەرییە وەنەوشەییە خۆیەتی، قاتی سێیەم.

– بەڵێ.

کە گەیشتمە چینی سێیەمی ئاپارتمانەکە، ئاورێکی لای دەستەچەپم دایەوە؛ بەدوای ناوی برادەرەکەی محەمەددا دەگەڕام: (نەوزاد نەجیب رواندزی).

لە ناکاو نووسینێکم بەکوردی بەرچاو کەوت کە لەسەر پارچە کارتۆنێکی



چوارگۆشە هەڵواسرابوو، لەژێرەوەیشی، شتێکی دیکە (دیاربوو بەفەرەنسی بوو). کاتێ لێی نزیک کەوتمەوە و کوردییەکەم خوێندەوە، نووسرابوو:
«تکایە لە دەرگا مەدە؛ نوستووم...»

من لە بەردەم دەرگاکە هێنکەهێنکم پێ کەوتبوو. سەیرە! من لە فلۆرەنساوە (تا ڤیزەی فەرەنسام وەرگرتووە!) بلیتی فرۆکەم بڕیوە، بەپەلەپەل خۆم گەیاندۆتە پاریس بۆ لای ئەو، کەچی ئەویش کارتۆنێکی لەسەر دەرگاکەی هەڵواسیوە و دەڵێ: «تکایە لە دەرگاکەم مەدە؛ نوستووم..»! زۆر سەیرە! ئەم کوردە لە هەموو شوێنێک هەر دەنوێ!

بە پشتی پەنجە، زۆر بەتوندی، سێ جار لەسەر یەکتر لە دەرگاکەم دا.

لەو کاتەدا پیرەژنێک کە گوجیلەیەکی بەپەتێکەوە بەدەستەوە بوو، لە قاتی چوارەمەوە، بەرەو خوارەوە دادەبەزی.

دیسان، تەماشایەکی دەرگاکەم کردەوە و بەپشتی پەنجە، زۆر بەتوندی، سێ جار لەسەر یەکتر لە دەرگاکەم دایەوە.

نەوزاد نەجیب رواندزی، برادەری محەمەد، پێنج ساڵ زیاتر لە فلۆرەنسا لەگەڵ محەمەد بەهەڤرا قوتابی بوونە. دوای ئەوەی پارەی لێ براوە و نەیتوانیوە خوێندنەکەی تەواو بکات؛ سەری خۆی هەڵگرتووە و هاتۆتە پاریس. ئێستا لەم شوققەیە دەژی.

نەوزاد نەجیب رواندزی! دەبێ ئێستا بێت و دەرگاکەم لێ بکاتەوە.

سەیرە! ئەویش لە ماڵەوە نییە.

چی بکەم؟

تەماشام کرد: پیرەمێردێک، کە گوجیلەیەکی بەپەتێکەوە بەدوای خۆیدا رادەکێشا، لە پێپلیکەکانی قاتی دووەمەوە، بەزەحمەت (هێنکە هێنکی پێ کەوتبوو) سەردەکەوت.

من دیسان، بەپشتی پەنجە، زۆر توندتر، سێ جار لەسەر یەکتر لە دەرگاکەم دایەوە.

– ئێ! ئێ...! ئێ..!

هاوارێک لەم دیو دەرگاکەوە بەرزبۆوە:






– هاتم!

دوو جار کلۆمی دەرگاکە سوورا و دەرگاکە کرایەوە.

– برای بەڕێزم، ببوورە ئەگەر لە خەوم کردی.

– فەرموو.

«نەوزاد نەجیب رواندزی» دەتگوت زندانکراوێکە و دەرگای زندانەکەی خۆیم لێ دەکاتەوە. دەموچاوی، یەکسەر، دەموچاوی کوڕە خاڵێکی خۆمی بیرخستەوە، کە نۆزدە ساڵ پێشتر، لە سەردانێکمان بۆ زندانەکەی – لە مووسڵ – چاوم پێی کەوتبوو: لاواز، درێژ، سەروقژ بژ، ناو ڕوومەت چاڵ، زەرد هەڵگەڕاو، ڕیشێکی چڵکنیشی بەردابۆوە.

«نەوزاد» لە واق وڕمانی من ورد دەبۆوە:

– فەرموو!

دیشداشەیەکی سپیی وەک دیشداشەی عارەبانی لەبەربوو، کە لە سێ شوێن پاشماوەی پەڵەپەڵەی مەرەگەیەکی لیخنی بەسەرەوە بوو.

گوتم: جەنابت کاک نەوزادی!

یەکسەر گوتی: هاتووی ببیەیتەوە؟

سەرم سوڕما، گوتم:

– کێ ببەمەوە؟

دیاربوو دەیویست درێژە نەدەینە قسەکانمان، دەیویست زۆر لەبەردەرگا ڕام نەگرێ؛ دەستی بۆ پێپیلکەکانی خوارەوە درێژ کرد. گوتی:

– لە خوارەوەیە، کاکە.

– کێ؟

– لەژێر قاڵدرمەکان دەنوێ.

گوتم: کێ؟

گوتی: تۆ بەدوای (نەوزاد رواندزی)دا ناگەڕێی؟

– با.

– ئێ، لە خوارەوەیە. ئەوەتا...

نیوەی لەشی لەناو دەرگاوە هێنا دەرەوە و پەنجەی بۆ قاتی خوارەوە درێژ



کرد:

– لە قاتی خوارەوەیە. لەژێر قاڵدرمەکان...

من ئنجا تێگەیشتم کە ئەم برادەرە (خۆ دەبوایە هەر لە سەرەتاوە بزانم: چونکە دیالێکتێکی سلێمانییانەی هەبوو) نەوزاد رواندزی نییە.

کابرای دیشداشە لەبەری پێش دەرگا گوتی:

– سێ ڕۆژ پێش ئێستا، یەکێک لە خزمەکانی هاتبوو، دەیویست بیباتەوە هەولێر. وام زانی جەنابیشت بۆ هەمان مەبەست هاتووی.

بە بیستنی ئەم هەواڵە، یەکسەر لە دڵی خۆمدا گوتم: «هەتا نەیانبردۆتەوە، با فریای کەوم».

– سوپاس.

بە پێپیلکەکاندا ڕام کردە خوارەوە، گوێم لەو برادەرەش بوو (پێش ئەوەی دەرگاکە دابخاتەوە و بچێ بنوێتەوە) گوتی:

– سەرچاوم.

لە قاتی خوارەوە چوومە ژێر قاڵدرمەکە، بینیم: بەڕاستی ماڵۆچکەیەکی لێیە! ماڵی (نەوزاد نەجیب رواندزی) لەم ژێر قاڵدرمە کوڵەوارەیە؟

کاتێ نزیک کەوتمەوە، توانیم شتەکان باشتر ببینم: جەستەیەکی زەبەللاح، درێژ، لەژێر دوو بەتانیەی زۆر ئەستووری بۆر و چڵکندا کەوتە جووڵە. ویستم لە خەوی هەستێنم، بانگم کرد:

– کاک نەوزاد!

ناونوێنە شەپرێوە بۆرەکە، کە چەند کارتۆنێکی پانوپۆڕی لەژێر ڕاخرابوو، بۆنێکی پیسی ناخۆشی لێ هەڵدەستا (کە لە بۆنی ڕشانەوە دەچوو).

ئەو بۆنە پیسە، یەکسەر، بۆنی ئەو پشیلە تۆپیوەی سەردەمی منداڵیمی بیرخستەوە کە بیست و حەوت ساڵ لەمەوبەر، لە تەنیشت دوکانەکەی باوکم، لەناو دوکانی خەڵووزفرۆشێک کە پێیان دەگوت مام ئەچقورت.. کەس نەیدەزانی چەند هەفتە و چەند مانگە لەوێ مردار ببۆوە و کەس پێی نەدەزانی! کاتێ دوکاندارە دراوسێکان بۆنی کەلاکی ئەو پشیلە تۆپیوەیان کرد ئنجا زانییان کە مام ئەچقورت خۆیشی لەناو دوکانەکەی خۆیدا گیانی






لەدەست داوە. مام ئەچقورتی بێ بناوان لەگەڵ پشیلە بەستەزمانەکەی پێکەوە مردبوون. کەس نەیدەزانی کامەیان پێش کامەیان مردووە، بەڵام هەردووکیان بەهەڤرا لەناو کڵۆ خەڵووزەکاندا کەڵەواژ ببوونەوە. ئەو ڕۆژە لەناو بازاڕەکە بووە هەرا. من و باوکم، سەبارەت بەوەی دراوسێی دوکانەکەی ئەو مام ئەچقورتە خەڵووزفرۆشە بێکەسە بووین، لە یەکەمین ئەو کەسانە بووین کە ویستمان بچینە ناو دوکانە تاریک و بەنسرمەکەوە. کاتێ یەکەمین هەنگاومان بەرەو ژوورەوە هەڵنا، بەبیرمە، باوکم یەکسەر ڕشایەوە. بەدەم ڕشانەوەشەوە، هەر هێڵنجی دەدا و پاشەوپاش دەکشایەوە. ئیتر بەم شێوەیە، بۆ ماوەی نیو کاتژمێر کەس نەیدەتوانی بچێتە ناو دوکانەکە لاشەی ئەو دوو بەستەزمانە غەریب و بێکەسە بهێنێتە دەرەوە. هەندێ لە دوکاندارەکان دەیانگوت: «ئەمە بۆنی پشیلە تۆپیوەکەیە»، باوکیشم دەیگوت: «نەخێر، ئەچقورت کە زندووش بوو هەر لەبەر بۆنی عارەق و ڕشانەوە، کەس نەیدەوێرا نزیکی بکەوێتەوە».

مام عومەری فافۆنفرۆش دەیگوت: لەبرسان مردوون.

سەید سەعیدی ئاسنگەر دەیگوت: هەردووکیان لەسەرمان ڕەق بوونەتەوە.

مەحموود زێڕنگریش دەیگوت: نەخێر، ئەو گەوادە ئیبلیسە بەعارەق مردووە.

– گوناحت دەگا! ئەدی پشیلەکەی؟

– پشیلەکەیشی، خوا دەزانێ چەند ڕۆژ و چەند هەفتە هەر لەناو ئەو کونە سەگە بەبرسێتی و تێنوویێتی ماوەتەوە و ئیتر ئەویش دوای ئەو تەواوبووە.

مام ئەچقورتی خەڵووزفرۆش، پیاوێکی کەتەی تێکسمڕاوی کورتەڵەی سوور و سپی، ژن و منداڵی نەبوو، ڕەبەن، لەناو دوکانە ڕەش و نووتەکەکەی خۆیدا، سی و حەوت ساڵ بوو هەر بەتەنیا دەژیا. باوکم دەیگوت: مام ئەچقورت بەئەسڵ تورکمانی خەڵکی ئۆزبەکستان بووە، کاتێ لەشکری رووس لەڕێگای چیای برادۆستەوە هاتوون روستێ و گەڵاڵە داگیربکەن، ئەچقورت سەربازی ڕووسیا بووە.. کاتێ گەیشتۆتە هەولێر



شەیدای ژنێکی تورکمانی هەولێری دەبێت و دەیخوازێ، دوای ئەوەش ئیتر ئێستاشی لەگەڵدا بێ نەگەڕایەوە مەملەکەتی خۆی.

باوکم دەیگوت: «ژنەکەی، دوای ساڵ و نیوێک، منداڵی لەبەرچوو، بۆیە گیانی لەدەست دا»، «ئیتر ئەچقورت دوای ئەوە، دڵی نەدەهات گۆڕی ژنەکەی بەجێ بهێڵێت. زۆری خۆش دەویست. تا ئەم دواییەش، هەمیشە، هەموو پێنج شەممەیەک لە قەبرستانی چراغ دەچوو بوتڵێک عارەقی لەسەر گۆڕی ژنەکەی خۆی تەواو دەکرد.. کاتێ تاریکیش دادەهات دەگەڕایەوە کولانەکەی خۆی».

من خۆیشم، بەبیرمە – ئەو کولانەیەی مام ئەچقورتم دیبوو– دوکانێکی خەڵووزفرۆشیی تاریک و بەنسرم، لە ژێرزەمینێکدا، بۆنێکی پیسی ناخۆش لەو ناوە هەڵدەستا کە نەمدەزانی بۆنی چییە!

دەستم بۆ لای سەری بەتانیەکە درێژکرد و لە سەرخۆ هەڵمدایەوە:

– کاک نەوزاد!

نەوزاد خەبەری نەبوویەوە. جارێکی دیکەش بانگیم کرد:

– کاک نەوزاد!

نەوزاد زۆر بەزەحمەت سەری بەرزکردەوە، بێ ئەوەی هەست بەهیچ لەناکاوییەک بکات:

– بەڵێ.

ئنجا ویستی ناولەپی خۆی لەسەر عەرز دابنێت و پشتی بداتە دیوار هەڵبستێتەوە، دەستی بەر قۆریەی چایەکەی تەنیشتی کەوت و ڕژاندی.

خەریک بوو پێی بڵێم «ببوورە»، پرسیم:

– تۆ کاک نەوزادی؟

تەنیا ترووسکاییەکی بەئاستەمی خۆر لەم ژێر قالدرمە شێدار و تاریکەی دەدا. چاوی «نەوزاد» دیار بوو خۆی لەبەر ئەم تاقە ترووسکاییە بەئاستەمەش ڕانەدەگرت، دەستی لەسەر برۆکانی کردە کەپر، دەیویست چاوی هەڵبهێنێ:

– بەڵێ.




هەستم پێ کرد، بۆنێکی پیسی تێکەڵ بەبۆنی عەرەق لە دەمییەوە دەهات؛ ئەو بۆنە ناخۆشە دەتگوت لە چاڵێکی قووڵی پڕ پشیلەی تۆپیوەوە هەڵدەستێ. خەریک بوو هێڵنجم بێتەوە.

ئەو گوتی:

– تۆ کێی؟

من لەبەر بۆنە ناخۆشەکە، هەندێ کشامەوە. گوتم:

– من ناوم مامۆستا فەرەیدوونە. لە سوێدەوە بۆ لای تۆ هاتووم.

«نەوزاد نەجیب رواندزی» گەنجێکی چوارشانەی قژن، سەروکەللەی لە سەروکەللەی ئەو گامێشانە دەچوو کە لە ئیسپانیا لەناو مەیدانەکاندا زۆرانبازییان لەگەڵ دەکەن و تیریان لێ دەدەن تا ئەوکاتەی کەلەواژ دەبنەوە. نازانم بۆچی من لەو دەمەدا ئەو کاک نەوزادەم وەک «گامێشێکی کەلەواژکراوەی ئیسپانی» هاتە بەرچاو. هەوڵی دەدا چاوی بەتەواوەتی هەڵبهێنێ تا «بمناسێتەوە» و بزانێ چیم دەوێ:

– فەرموو.

لەو دەمەدا، لەژێر تیشکی ترووسکاییبە کزەکەی ئەو ناوەدا، تێبینیی ئەوەم کرد کە دوو ددانی پێشەوەی نەوزاد شکابوون. لێم پرسی:

– تۆ محەممەد دەناسی، کاک نەوزاد؟

– محەممەد کێ؟

– محەممەد حەمە رەحیم شوانی! خەڵکی کەرکووکە.

نەوزاد، دیاربوو، لە سەرخۆشی و مەستییەکی زۆر قووڵەوە گەڕابۆوە؛ بەڵام دەمودەست بیری کەوتەوە:

– ئا.. ئێ .. ئێ. محەممەد کەرکووکی؟

– دەیناسیت؟

– بەڵێ دەیناسم.

لەو دەمەدا هەستم کرد پیاوێک لە رووناکیی ناو دەرگاکەوە دێتە ژوورەوە و لە ئێمە نزیک دەبێتەوە. دیتم شوفێری تەکسیەکەمە، گوتی:

– هەستم کرد زۆر دواکەوتیت، بۆیە هاتم.



ئنجا گوتی:

– ئەمە کێیە؟

منیش (وەک ئەوەی هەست بەشەرمەزاری بکەم) گوتم:

– ئەمە نەوزادە.

شوفێرەکە کەمێک سەری دانەواندبوو بۆ ئەوەی نەوزاد لەناو تاریکییەکەدا باشتر ببینێ.

لە ناکاو، ژنێک (ژنێکی قەڵەوی خڕ، پۆشتەوپەرداغ، سپیکەڵە، دیاربوو فەرەنسی بوو) لە قاتی یەکەمەوە، سەری بەرەو خوارەوە، بۆ لای ئێمە، شۆڕکردبۆوە و لەسەر شیشەی قالدرمەکانەوە یەک بەدەنگی خۆی هاواری دەکردە سەرمان. بۆڵە بۆڵی بوو. من وا تێگەیشتم جنێومان پێ دەدات و هەڕەشەمان لێ دەکات.

ڕاستییەکەی، کەمێک ترسام. چاوم لە قاتی سەرەوە، لە شوفێرەکەم پرسی:

– ئەوە دەڵێ چی؟

شوفێرەکە بێ ئەوەی بشڵەژێت، لەسەرەخۆ پێیی گوتم:

– دەڵێ: ئەو حەشیشەکێشە چڵکنە ببەنەوە وڵاتی خۆتان... پیرۆزی خۆتان بێ!

ژنە فەرەنسییەکە، لەوە دەچوو خاوەنی ئاپارتمانەکە بێت، هەر بۆڵەبۆڵی بوو. شوفێرەکە بەچرپە تەرجەمەی قسەکانی بۆ دەکردم:

– دەڵێ: بۆ ماوەی پێنج مانگ کرێی شوقەکەی نەداینێ و خواردی، ئێستاش ئەوا حەوت مانگ زیاترە ئەم ژێر قالدرمەیە چۆڵ ناکات. هەر دەری دەکەین، هەر دێتەوە. پۆلیسیش دەرەقەتی نایە. ئەم گەڕەکەی ئێمەی پیس کردووە.

ژنە هەر هاوار هاواری بوو.

گوتم: دەڵێ چی؟

– دەڵێ: ئەگەر بمزانیایە کورد هێندە پیس و پۆخڵ و بەربادن، هەر لە ئەوەڵەوە خۆم تووشی ئەم بەڵایە نەدەکرد و خانووم بەکرێ نەدەدایە.






پاشان ژنەکە زۆر قایمتر دوو جاران لەسەر یەکتر قیژاندی. دیاربوو پرسیارێکی دەکرد و دەیویست ئێمە وەڵامی بدەینەوە.

– دەڵێ چی؟

– دەڵێ: «بۆ نایبەنەوە؟». دەڵێ: «بۆ نایبەنەوە، بەڵکو ئەم گەڕەکە ئیسراحەت بکات؟».

نەوزاد دەیویست سەرنجی ئێمە بۆ خۆی ڕابکێشێت، دەستی بۆ سەرەوە بەرز دەکردەوە و لچی هەڵدەقورتاند:

– دەفنی کەن! سۆزانییە. وازی لێ بێنن.

ژنەکە لە هاتوهاواری خۆی نەدەوەستا، تەنانەت لە ناکاو زۆر گورج و گۆڵانە، هەر هێندەم زانی بەپێپلیکەکانەوە گەیشتە خوارەوە و ڕووی لە ئێمە کرد. من واقم ورمابوو، دەشترسام، بەتایبەتیش لەبەر ئەوەی نەمدەزانی دەڵێ چی.

لە شوفێرەکەم پرسی:

– مەسەلە چییە؟

شوفێرەکە گوتی:

– وا دەزانێ ئێمە هاتووین بۆ ئەوەی حەشیشەی پێ بفرۆشین.

– دەڵێ چی؟

شوفێرەکە ئەمجارە وەڵامی شپرزانی منی نەدایەوە، زۆر بەنەرمی چەند قسەیەکی لەگەڵ ژنە فەرەنسییەکە کرد و ڕووی کردەوە من (وەک ئەوەی من دڵنیا بکاتەوە):

– وادەزانێ کە ئێمە برادەر و خزمی ئەوین، یان حەشیشەی پێ دەفرۆشین و هاوتیپی ئەوین.

–ئێ؟

– هیچ نییە. تێم گەیاند.

ژنەکە هەندێک ئارام ببۆوە، بەتەپەتەپ وەسەر پێپیلکەکان کەوتەوە؛ بەڵام یەک چرکە چییە دەمی نەدەوەستا.

من دڵنیا بووم کە جنێوی دەدا. لە شوفێرەکەم پرسی:

– ئەوە جنێو دەدا، وا نییە؟



شوفێرەکە، بەداخ و خەفەتەوە، گوتی:

– بەڵێ، دەڵێ «ئەم کوردانە پاریسیان پیس کردووە».

– بۆ؟

– دەڵێ: لە وڵاتی خۆیان لەبرسان غاردەدەن و دێن لەسەر ورگی ئێمە دەژین.

– سۆزانییە، دەفنی کەن! ڕاسیستە.

پاشان، شوفێرەکە بێ ئەوەی گوێ لە قسەکانی نەوزاد ڕابگرێ، ڕووی کردەوە من و گوتی:

– دەی، من لە دەرەوە چاوەڕێت دەکەم. کاری خۆتی لەگەڵ تەواو بکە! بەڵام زوو.

کە گەڕامەوە لای نەوزاد، هەر لچی لە ژنەکە هەڵدەقورتاند و دەستی بۆ سەرەوە ڕادەوەشاند:

– ڕاسیستە. دەفنی کە! سۆزانییە.

ئەمە بێ ئەوەی نەوزاد تۆزقاڵێک چییە لە ناو نوێنەکەی خۆی بجووڵێت. هەر لەژێر قاڵدرمە تاریک و بەنسرمەکەوە، خۆی ئامادەکردبوو تێ بگات من بۆچی هاتوومەتە لای.

نزیک لە شێوازی پاڕانەوە، بۆ کاک نەوزاد نوشتامەوە:

– کاک نەوزاد، نازانی محەمەد لە کوێیە؟

نەوزاد پێکەنی:

– محەمەد کەرکووکی؟

– بەڵێ. نازانی لە کوێ دەژی؟

نەوزاد دیسان پێکەنی:

– محەمەد زۆر برادەرم بوو.

– ئێستا چووە بۆ کام شار؟

– هەشت نۆ مانگێک لێرە هەر پێکەوە بووین. لێرە بوو.

– لێرە؟

– لە پاریس. بەڵێ.

– ئەدی ئێستا، چووە بۆ کام شار؟




- لە ئەڵمانیایە.
- ئەڵمانیا ؟!
- بەڵێ. وابزانم.
- کەی چوو بۆ ئەوێ ؟
- لەمێژە. زۆر لەمێژە.

نەوزاد بەتەواوەتی چاوەکانی کەوتبوونەوە ترووسکانەوە. کە سەری هەڵدەبڕی و تەماشامی دەکرد، دیاربوو لێم ورد دەبۆوە بزانێ من کێم، یان منی لە کوێ دیوە؟ گوتی:

- جگەرەت پێیە ؟

منیش کاغەزی پەنجا فڕەنکێکی فەرەنسیم لە گیرفانی ڕاستم کەوتە بەر چنگ، دامێ، گوتم:

- دوایە بۆ خۆت جگەرەی پێ بکڕە! پێم بڵێ: نازانی لە ئەڵمانیا لە کام شارە؟
- لە بەرلینە.
- لە بەرلین؟
- بەڵێ

نەوزاد دەستی لەژێر کارتۆنەکانی ژێر بەتانیەکە دەرهێنا و قوونکە جگەرەیەکی دەرهێنا. کاتێ جگەرەکەی داگیرساند، گوتی:

- من پێشتر ماڵم لە قاتی سەرەوە بوو، ئەم سۆزانییە دەرمی کرد.
- کاک نەوزاد، ناونیشانی محەممەدت لە بەرلین پێ نییە؟
- نەء، چونکە زۆر لە مێژە ئاگام لێی نییە. کە گەیشتمە ئەوێ، دوای چەند مانگێک پۆستکارتێکی بۆم نارد.
- ئەو پۆستکارتەت لە لا نەماوە؟
- نەماوە.

ئنجا پێکەنی:

- ئەم سۆزانییە ماڵەکەمی لێ تێک دا. نابینی!

نەوزاد لە ناکاو جگەرەکەی لە دەمی کردەوە و گوتی:

- بەڵام نووسیبووی کە لە هوتێلێک ئیش دەکا.



- نازانی ئەو هوتێلە ناوی چییە؟
- بۆمی نووسیبوو. ناونیشانەکەیشی نووسیبوو؛ بەڵام لە بیرم نەماوە. لام نەماوە.

(نەوزاد نەجیب رواندزی) بەتەواوەتی لە خەوەکەی خۆی هەڵسابۆوە، بەڵام لە ناو نوێنە شڕەکەی خۆی تۆزقاڵێک چییە، نەدەجوولا.

کە پێکەنی، دیسان دوو دانە شکاوەکەی، لەناو ڕیزە ددانە زەردهەڵگەڕاوەکانیەوە وەدیارکەوتن و دیسان بۆنێکی پیسی ناخۆشی پرژاندەوە رووم:

- محەمەد کەرکووکی..! گفتی دامێ ئەگەر بگاتە ئەڵمانیا و ئیشێکی دەست بکەوێ، پارەم بۆ بنێرێت! کەچی تا ئێستا یەک فڕەنکی بۆ نەناردووم.

من کەوتمە سەر ئەوەی هەناسەسارد بڕۆم و خواحافیزی لە نەوزاد بکەم، گوتم:

- .. لەوانەیە ببینم.

لەو دەمەدا، گوێم لە هۆڕنی تەکسییەکەم بوو، لە دەرەوە بانگی دەکردم. نەوزاد گوتی:

- ئەگەر بینیت، ئەو گلەیییەی منی پێ ڕابگەیەنە! بڵێ: «هەی بێ وەفا...»

من پشتم کردە قسەکانی نەوزاد و نەمزانی چیی دیکەی گوت.. بەپەلە خۆم گەیاندەوە ناو تەکسییەکە.

## ٨

ئەم هەموو درۆ و دەلەسە و غارە غارە، ئەم هەموو ماندووبوونەی ئەم هەموو ساڵانەت، ئەم هەموو سنووربڕینە بێهوودەیەت، ئەم هەموو وڵاتە و وڵات ڕۆیشتنەت، ئەم هەموو دایەرەی پۆلیس و پەناهەندەیی و تەندروستی و بەلەدیە و تەحقیق و تەحقیقکارییە، ئەم هەموو هەستکردنەت بەبێ وڵاتی و بێکەسی و بێ نرخیەی خۆت..! چی بکەیت؟




باشە تۆ بۆچی ڕۆژێک بیرت لەوە نەکردۆتەوە (هیچ نەبێ بەسەردان) سەرێکی شارەکەی خۆت بدەیتەوە و ماڵی خۆتان ببینیتەوە؟ ئەوا یازدە ساڵ زیاترە دوورەوڵات و ئاوارەی! ئاخر باشە، بگەڕێیتەوە چی بکەیت؟ کێ ببینی؟ کوێ ببینی؟ پاشان، دەی، بەچی بگەڕێیتەوە؟ دوو هەزار و پێنج سەد مارک بەشی چیت دەکا، چەندی لێ پاشەکەوت بکەی؟

بچیتەوە بۆ لای کێ؟ برا گەورەکەت یازدە ساڵ پێشمەرگەی ئەو حزب بوو.. ئەم حزب شەهیدی کرد. برا بچووکەکەشت نۆ ساڵ پێشمەرگەی ئەم حزب بوو.. ئەو حزب شەهیدی کرد. دایکیشت، گوناح گوناح، دوای بێ سەروشوێن مانەوەی سوهامی خوشکت، کۆستی کەوت و بەحەسرەتی ئەو سەری نایەوە. ماوەتەوە باوکت. ئەویش هەبێ و نەبێ چاوەڕێی ئەوە دەکات تانیا و منداڵەکانی بگەنە ئەم ناوە و ئیتر ئەویش بەدوایاندا بێت! ئەوەیە ئیتر، ئەمڕۆ لە کوردستان هەموو ڕێیەک هەر دەتهێنێتەوە ئەورووپا!

تۆ بڵێی بتوانیت جارێکی دیکە (ڕەحیماوای منداڵیت) ببینیتەوە! تۆ بڵێی جارێکی دیکە بتوانیت پیاسەیەکی دیکە بەبەردەم مەکتەبەکەی کچانی (ئەسیری)دا بکەیتەوە و کچە ئەسمەرە ئەگریجە شۆڕە شۆڕیجەییەکان ببینیتەوە؟ منداڵیت، ئاخر.. حەیف، وەک ئەو قەڵاتەی کە دەیڕوانییە پەنجەرەی ماڵەکەتان، خاپوور کرا. تازە.. تەواو.. ناگەڕێیتەوە. باوەڕ ناکەی. نە. هەموو کوردی ئەورووپا و ئەمریکا حەز بکەن بگەڕێنەوە کوردستان، تۆ هەرگیز حەزی ئەوەت نییە و باوەڕیش ناکەیت بگەڕێیتەوە! نەخێر. بگەڕێیتەوە بۆ کوێ؟

هیمەتی هاوڕێت، پار، لەگەڵ یەشار، لە هۆڵەندەوە گەڕابوونەوە هەولێر.. کاتێ هاتبوونەوە ئەمستردام، بەتەلەفۆن پێیان دەگوتیت:

– هەر نەچیتەوە باشترە.

– بۆچی؟

– لە هەولێر هەستمان دەکرد بەتەواوەتی غەریبین.

– بۆچی؟

– پاشان چووینە سلێمانی. ئەوێش هەر بەهەمان شێوە بوو.



– بۆچی هەستتان بەغەریبی دەکرد؟

– هەموو کەسێک کە دەچێتەوە وڵاتی خۆی، دەچێ شاری خۆی دەبینێتەوە. کەچی شاری ئێمە، لە ئێمە قەدەغە بوو. نەمانتوانی بچین گەڕەک و کۆڵانەکانی منداڵیی خۆمان ببینینەوە! لەناو ئوتومبیلەکەی نێوان حاجی ئۆمەران و هەولێر یەک دوو گەنجی هەولێریمان لەگەڵدا بوو، لە حاجی ئۆمەرانەوە تا گەیشتینە هەولێر هەر گۆرانییان دەگوت و نوکتەی خۆشیان بۆ یەکتر دەگێڕایەوە، چونکە دەیانزانی لە هەولێر دایکیان، خوشکیان، برایان، باوکیان، کەسوکاریان پێشوازییان دەکات و لەباوەشیان دەگرێ.. بەڵام ئێمە.. هەردووکمان، غەریب، بەتەواوی واتای «غەریب» غەریب بووین.. تەنانەت هەستمان بەدڵتەنگی و بەدبەختییەکی زۆریش دەکرد. کاتێ نزیکی هەولێر کەوتینەوە، لەناو ئوتوومبیلەکە حەزمان دەکرد بگرین.

– بۆچی؟

– ئەی چی؟ چی ئێمەی دەگەیاندەوە کەرکووک!

– ئەی دایک و باوک و خوشک و براتان.. نەهاتنە لاتان؟

– هاتن. چوار پێنج ڕۆژێک لە هەولێر یەکترمان بینی و گەڕانەوە. لە هەولێر و سلێمانی، کەسمان نەدەناسی، کەس نەیدەناسین.. عەینەن ئەمستردام. هێشتا ئەمستردام چاکترە، چونکە هیچ نەبێ وا چەند ساڵێکە لەگەڵی ڕاهاتووین.

ئەوەیە! تۆش لەگەڵ ئێرە ڕاهاتوویت. باشیش ڕاهاتوویت. بەڵام خۆ تۆ بەلای کەمییەوە هەر دەبووایە چاوێکت لە باوکە تەنیا و بێکەسەکەت بووایە: ڕۆژ تا ئێوارە ئێوەی بە(دوکانی پێڵاو فرۆشییەکەی) بەخێوکرد. کاتی خۆی پوول بەپوول کۆی دەکردەوە بۆ تۆی دەنارد، دەیگوت: «با کوڕەکەم ببێتە ئەندازیار». کاتی خۆی سێ جاران بەڵێن وابوو سەردانێکی فلۆرەنسا بکات و بێتە لات بتبینێ، هەر نەڕەخسا. بەڵام بەڵێن بێ: لەم ڕۆژانە، بزانیت ئاخۆ کێ لە برادەرە کوردەکانت دەگەڕێتەوە هەولێر، نامەیەک و پێنج سەد مارکێکی لەگەڵدا بۆ بنێریتەوە.. هیچ نەبێ ناونیشانی ئێستای خۆتیشی لە بەرلین بۆ بنێریت! ئێستا بێگومان دڵی







بەو نامەیەت زۆر خۆش دەبێ. دەڵێ: «ئەوەتا ، کوڕەکەم، دوای ئەم هەموو ساڵە بەدبەختی و ئاوارەییە، نامەیەکی جوان و پێنج صەد مارکێکی بۆ ناردم!».

باوکت نازانێ کە تۆ ئیتاڵیات بەجێ هێشتووە و ئێستا لە ئەڵمانیا دەژیت. تانیای خوشکیشت هەر نازانێ. چۆن بزانن؟ بۆ بزانن؟ ئەدی چی! تۆ بۆچی سەری ئەوان بەگرفتی خۆت بیەشێنیت؟ ئنجا خۆ وایشە. بۆچی هەناوی ئەوانیش پڕ لە خەم و خەفەت بکەیت؟ بەڵام تۆ بڵێی ناسیاوێک، ئاشنایەکی تۆ هەواڵی تۆی پێ نەگەیاندبن؟ شەرمین خانی کچی خودادادی گۆرانیبێژ خۆ لە کۆپنهاگنەوە نامەی بۆ ماڵی بەهجەتی هاوڕێت ناردبوو و پێی گوتبوون کە کوڕەکەیانی لە ئۆسلۆ دیوە!

بەبیرتە: هەفتەیەک پێش ئەوەی فلۆرەنسا بەرەو پاریس و پاشان بەرەو بەرلین بەجێ بێڵیت، نامەیەکت بۆیان نارد و نووسیبووت کە لەوانەیە بچیت لە جەزیرەیەکی ڕۆژئاوای ئیتاڵیا لە چێشتخانەیەک کار بکەیت؛ یانیش لەوانەیە بچیتە وڵاتێکی دیکەی ئەورووپا و لەوێ داوای مافی پەناهەندەیی بکەیت. ئەمە کەی بوو؟ بەتەواوەتی بیرت نییە، بەڵام وابزانیت ئاخروئۆخری ساڵی ١٩٨٥بوو. ئێستا دە دوازدە ساڵ زیاترە بەسەر ئەو ڕۆژەدا تێپەڕ دەبێ و تۆ تازە دەتەوێ نامەیەکی دیکەیان بۆ بنێریت. ئاخر، بڵێی چی؟ بڵێی «بابە گیان نەمتوانی خوێندنەکەم تەواو بکەم و ببمە ئەندازیار، لێم ببوورە!»؟ بڵێی «لە بەرلین بەشەوان لە هوتێلێک پاسەوانێتی دەکەم و وەزعم زۆر باشە!»؟ بڵێی چی؟ بڵێی «چاوەڕێتان دەکەم. ئێوەش وەرنە دەرەوە»؟ تا لە فلۆرەنسا بوویت، باش بوو، تاقەتت هەبوو: زوو زوو تەلەفۆنت بۆ ماڵە دراوسێکەتان لە کەرکووک بۆ دەکردن و بانگیان دەکردن هەندێ قسەت لەگەڵیان دەکرد، بەتایبەتیش لەگەڵ دایکت. بەڵام دوای ئەوەی فلۆرەنسات بەجێ هێشت، لەو ساتەوە ژیان لە ئەوانیش و لە تۆش تێکچوو: ئەوان حکوومەت دەری کردن و ئاوارەی هەولێری کردن، تۆش سەری خۆت بەرەو پاریس و پاشانیش بەرەو ئەم بەرلینە هەڵگرت.

ماڵی هیمەت لە (ڕەحیماوا) هێندە لە ماڵەکەی ئێوە دوور نەبوو.



کاتێ لە هەولێرەوە گەڕابۆوە ئەمستردام، نامەیەکی بۆت ناردبوو، نووسیبووی:

«محەمەد گیان، ئێستا ماڵی ئێوە لە کەرکووک نەماون. دەرکراون و هاتوونەتە هەولێر. بەداخەوە نەمتوانی بزانم لە کام گەڕەکن و ناونیشانیان چییە: ئەگینا سەرێکم هەر لێ دەدان، بەڵام دایکم دەیگوت:

– پێی بڵێ کە باوکی سحەتی باشە. خوشکەکەیشی، تانیا خان، شووی بەمامۆستایەکی خەڵکی هەولێر کردووە و ئێستا دوو منداڵیان هەیە».

ئەمە هەموو شتێکە کە تۆ ئێستا لەبارەی باوکت و تانیای خوشکت دەیزانیت. ڕۆژێکیش لە ناکاو،.. ئا، بیرت کەوتەوە: کوڕێکی گەنجی تەمەن ١٨–١٩ ساڵێک دەبوو، تازە گەیشتبووە بەرلین، لەگەڵ گەنجێکی دیکەی هاوتەمەنی خۆی، لە بەردەم چێشتخانەیەکی شاورمەی یۆنانی، لە شەقامی تووبینگن شتراسە لەلای بورجەکە، سەندەویچی گەصیان دەخوارد و بەکوردی قسەیان دەکرد. تۆش لە تەنیشت ئەوان وەستابوویت سەندەویچت بەدەستەوە بوو، کاتێ بینیت ئەو دوو گەنجە بەکوردی قسە دەکەن، دڵت خۆش داهات، دوواندتن. هەواڵی کوردستانت لێ پرسین و سۆراغی شەڕوشۆڕی براکوژیت لێ کردن. لە کۆتاییدا بۆت وەدیار کەوت کە ئەو کوڕە گەنجە هەولێرییە دەبێتە ئامۆزای خاڵی زاواکەتان. تۆش، زۆرت پێ سەیر هات کە لەم بنی دنیایەدا ڕێککەوتی «خزمێکی خۆت» بکەیت کە بەدرێژایی ژیانت نەتدیوە و نەتناسیوە. تۆ زۆرتر بۆ دڵخۆشکردنی ئەو کوڕە گەنجە، لێت پرسی:

– ناوی زاواکەم چییە؟

گوتی:

– مامۆستا فەرەیدوون. مامۆستای کیمیایە.

لێت پرسی: «ئەدی تانیا چۆنە؟»

گوتی: «باشە. دوو منداڵیان هەیە».

پاشان، گوتی:

– کاتێ من لە هەولێرەوە بەرەو تورکیا بەڕێ دەکەوتم، ئەوانیش






دایاننابوو دەرچن.

– بەرەو کوێ؟

– نازانم، بەڵام دەیانگوت «دەچینە خاریج».

بە بیرتە: ناونیشانی خۆت لەسەر پارچە کاغەزێک نووسی و داتە ئەو کوڕە گەنجەی «ئامۆزای خاڵی زاواکەت»؛ لە بیریشت کرد لێی بپرسی:

– تۆ ناوت چییە؟

– گود مۆرگن سیروان!

تۆماسی خاوەن هوتێلەکە بوو، دیسان ڕۆژنامەی «فۆغن پلات»ی بەدەستەوە بوو، وەک هەموو بەیانییەک، کاتژمێر حەوت و پەنجا دەقیقە گەیشتە سەرت.

– گود مۆرگن هێر تۆماس.

## ٩

لەبەرخۆیەوە، شوفێرەکە پێی گوتم:

– تۆ لە سوێدەوە هەڵتەک هاتوویت بۆ پاریس، بۆ لای کلۆشاغێک!

منیش پرسیم:

– «کلۆشاغ» چییە؟

– لانەوازێکی لەسەر جادە کەوتوو، ئەوانەی تریاک ژیانیان لێ دەسەنێتەوە و لەناو میترۆ و لە پەنا دیوارەکاندا دەنوون.. بەفەرەنسی لێرە پێیان دەڵێن «کلۆشاغ».

من، سەرێک و هەزار سەودا، نەمدەزانی بیر لە کام گرفتێک بکەمەوە، گوتم:

– کاکی برا، هەموو ئەو شتانەی لە ژیانتدا نەتدیون، لە غەریبی و لە دوورەوڵاتیدا دەیانبینیت.

شوفێرەکە، من پێم گوتبوو کە – بۆ ئەوەی پارەی زیاد لە پاریس خەرج نەکەم و لە هوتێل نەمێنمەوە، هەروەها سەبارەت بەوەی کە هەر ئەمڕۆ



کاتژمێر حەوتی ئێوارە فڕۆکەیەک بەرەو ستۆکهۆڵم بەڕێ دەکەوێ بەڵکو فریای کڕینی بلیتێک بکەوم – پێویستە دەمودەست هەر ئەمڕۆ بگەڕێمەوە سوێد.

شوفێرەکە، هەر بەدیالێکتە مووسڵاوییەکەی خۆی، لێمی پرسی:

– ئێستا بڕیارت دا بگەڕێیتەوە سوێد یان بچیتە بەرلین؟

– نەخێر وا باشترە یەکەم جار بگەڕێمەوە ماڵەکەی خۆم لە مالمۆ. پاشان لەوێوە بەشەمەندەفەر، دەچم سەرێک لە بەرلین دەدەم.

– دەچی بۆ بەرلین؟

– بەڵێ.

– من پێم وانییە کلۆشاغێکی ئاوها تا ئەو ڕادەیە شتی لەبیر مابێت کە تۆ متمانە بەقسەکانی بکەیت.

منیش، وەک ئەوەی گازاندە لە بەختی خۆم بکەم، گوتم:

– ئەم کوڕە، کاتی خۆی، پێش ئەوەی صەدام حوسێن کوێت بگرێت، لەگەڵ محەمەدی ژنبراکەم لە فلۆرەنسا پێکەوە قوتابی بوونە.

– لەوانەیە چارەسەری دیکەشت نەبێ، بۆیە بەقسەکانی ئەو باوەڕ بکەی..

– ئنجا من بەهەزار حاڵیش تا ناونیشانی ئەم «کلۆشاغەم» دۆزیوەتەوە.

– لە ئەورووپا ناسیاوێکت نەبێ یارمەتیت بدا، ناخۆشە.

– پێنج ڕۆژ لە فلۆرەنسا مامەوە بەس بۆئەوەی ناونیشانی محەمەدی ژنبراکەم بدۆزمەوە، بەدوای کەسێکدا دەگەڕام کە هیچ نەبێ بیناسێت، تەنانەت چوومە زانکۆکەیشی. پۆلیسخانەکان و دایەرەی پەناهەندانیش گەڕام.

– بۆ؟!

– چونکە من تا ئەوکاتەش لەسەر ئەو باوەڕە بووم کە محەمەدی ژنبرام هەر لە فلۆرەنسایە و ژن و دوو منداڵەکەشم هاتوون بۆ لای ئەو. لە هەولێرەوە بەتەلەفۆن هەر ئاوهایان پێ دەگوت.







– خەزوورەکەت وای پێ دەگوتیت.

– بەڵێ. لە فلۆرەنسا هەمـوو دنیـا گـەڕام بەدوایدا. بێـهـوودە بـوو. نە پۆلیس، نە دایەرەی پەناهەندان، نە زانکۆکـەی (تەنانەت دوو برادەری دیکەیشیم دۆزییەوە) کەسیان نەیاندەزانی چووە بۆ کوێ!

– قاچاغچییەکان وایان پێ ڕاگەیاندووە!

– بەڵێ. ئیتر، لە دوایین ڕۆژدا، ماندوو بووم، دامنابوو بگەڕێمەوە مالمۆ، یەکێک لەو دوو برادەرە کۆنەی محەمەد، لە ناکاو هات بۆ هوتێلەکەم و گوتی:

– مژدە!

– خێر؟!

– ناونیشانی برادەرێکی ئەوت دەدەمێ لە پاریس، کاتی خۆی لێرە پێکەوە قوتابی بوونە.

شوفێرەکە گوتی:

– ئمم.. کەواتە ئاوها بوو کە جەنابت ڕێگەت کەوتە لای ئەم بەستەزمانە.

– بەڵێ..

شوفێرە مووسڵاوییەکە دەیویست کۆتایی بەم گفتوگۆیە بێنێن، گوتی:

– باشە، دەی. خێری پێوەیە. دەیاندۆزیتەوە ئینشاڵڵا.

لەناو فڕۆکەخانەی (شارڵ دوگۆڵ)، من تا ئەو چرکەیەی بلیتیشم بۆ ستۆکهۆڵم بڕی، هەر دوودڵ بووم: بچمە بەرلین یان بگەڕێمەوە مالمۆ؟

دەمویست بچم بۆ بەرلین، بەڵام بەتەواوەتی دڵنیا نەبووم ئاخۆ محەمەدی ژنبرام سەد لە سەد لە بەرلین دەدۆزمەوە یان نا؟ لە هەمان کاتدا دەشمویست بگەڕێمەوە ماڵەکەم لە مالمۆ لەبەرئەوەی حەزم دەکرد بزانم چ هەواڵ و نامەیەکی تازەم– لەوانەیە لە کوردستانەوە یان لە ئەستەمبۆڵەوە– لەبارەی ژنەکەم و دوو منداڵەکەم بۆ هاتووە؟ هەر چۆنێک بێ، دوو ڕێگەم لە پێش بوو. دەبووایە هەردووکیشیان تەی بکەم. ئەمە جگە لەوەی ڕێگەی سێیەمیشم هەبوو: تەلەفۆنێک بکەم بۆ کوردستان و قسە لەگەڵ



خەزوورەکەم بکەم، بزانم ئاخۆ لەگەڵ قاچاغچییە کەرکووکییەکەی خزمی خۆیان چیی کردۆتەوە؛ چ هەواڵێکی تازەی لەبارەی تانیا و دوو منداڵەکەمان پێیە؟

بلیتی کاتژمێر حەوتی ئێوارەم بەرەو ستۆکهۆڵم بڕی و بەپەلە، جانتا گەورەکەم بەسەر شانمەوە، بەناو هاتوچۆی ڕێبوارەکانی ناو فڕۆکەخانەدا، چاوم بەدوای تەلەفۆنێکدا دەگێڕا. تەماشای کاتژمێرەکەی مەچەکم کرد: هێشتا پێنج سەعات و نیوم مابوو فڕۆکەکەم بەرەو ستۆکهۆڵم هەڵبفڕێ. لەگەڵ ئەوەش، هەستم دەکرد دەبێ پەلە بکەم. نازانم بۆچی.

کاتێ کابینەی تەلەفۆنێکم بینی، ئنجا بیرم کردەوە دەبێ کارتێکیش بکڕم! لەو دەمەدا، لەناو ئەو قەرەباڵغییە بێ ئەندازەیەی لای فرۆشیاری کارتی تەلەفۆنەکان، نازانم بۆچی لەناکاو پرسیاری شوفێری تەکسییەکەم بیرهاتەوە کە لێمی پرسی: «تۆ ناشزانیت ژنبراکەت لە کام وڵاتە؟!». هەستم دەکرد من ئێستا تێدەگەم کە شوفێرەکە بەتۆنێکی گاڵتەجاڕییەوە ئەم پرسیارەی لێم کرد، بەشێوەیەکی ئەوتۆ کە بە«ساویلکە»م بزانێت و هەوڵدانەکەشم بە«شتێکی بێهوودە» لە قەڵەم بدات.

ئەوەی لە هەموو شتێک زیاتر ئازاری دەدام و خستبوومیە گێژەنێکی ڕەتێنەوە ئەوە بوو کە خەزوورم لە سەرەتادا پێی دەگوتم: «قاچاغچییەکان ناسیاوی خۆمانن؛ تا نەیانگەیەننە دەست خۆت لە شاری مالمۆ، بەرەڵایان ناکەن»، کەچی پاشان، ئێستا پێم دەڵێ: «قاچاغچییەکان گەڕاونەتەوە هەولێر و دەڵێن: تانیا و دوو منداڵەکەمان سپاردۆتە دەست محەمەد لە فلۆرەنسا».

تێناگەم. بۆچی چوونەتە ئیتاڵیا؟ چ شتێک وای لێ کردوون ئاراستەی خۆیان بگۆڕن و ڕووبکەنە ئیتاڵیا؟ خۆ قاچاغچی دەبێ باش بزانن کە ئیتاڵیا پەناهەندە ڕاناگرێ. زۆر زەحمەتە. بێگومان ڕێگە و ڕێگە دەیانگەڕێننەوە ئەو وڵاتەی لێیەوە هاتوون! تۆ بڵێی قاچاغچییەکان – خۆیان ئەم ڕێگە سەختەیان پێ باشتر بووبێت؟ باوەڕ ناکەم. بۆچی؟ خۆ لەوانەشە تانیا خۆی بڕیارەکەی پێ گۆڕیبن. بەڵێ، هەبێ و نەبێ تانیا بەرنامەکەی پێ گۆڕیبن. لەوانەیە پێی وابووبێت کە ڕێگەی ئیتاڵیا

ئاسانترە و زووتریش دەگەن. گوتوویەتی «با سەرێک لە محەمەدی براشم بدەم». بەڵام ناونیشانی محەمەدیان چۆن دۆزیوەتەوە؟ بڵێم چی! خۆ لەوانەشە لەوکاتەدا ڕووداوێک هاتبێتە پێشەوە و تێکڕا ناچار بووبن ڕێگەی ئیتاڵیا هەڵبژێرن.. بەڵام سەیرە! ڕێککەوتنیان لەگەڵ قاچاغچییەکە ئاوها بوو کە بەپەساپۆرتێکی ساختەی ئەڵمانی، یەکسەر لە فڕۆکەخانەی ئەستەمبۆڵەوە هەڵیانفڕێنن بەرەو ستۆکهۆڵم. پێش ئەمەش، واتە پێش ئەوەی لە ئەستەمبۆڵەوە بەرەو ستۆکهۆڵم هەڵفڕن، بەچەند سەعاتێک، دەبووایە تەلەفۆنێک بۆ من بکەن و ئاگادارم بکەنەوە: بۆ ئەوەی من بزانم کەی و چ سەعاتێک دەگەنە فڕۆکەخانەی ستۆکهۆڵم؟ ڕێگەی دووەمیشیان، لەگەڵ هەمان قاچاغچی بەم شێوەیە بوو: لە ئەستەمبۆڵەوە بەهەمان پەساپۆرتی ساختەی ئەڵمانی- کە هەر لە هەولێر بۆی کڕیبوون- بەرەو وارشۆ هەڵفڕن، لەوێشەوە، لەسەر سنووری پۆڵۆنیاوە، سواری کەشتی ببن و بەوپەڕی سەلامەتیەوە بگەنە قەراغەکانی سوێد و منیش لە مالمۆوە بچمە پێشوازییان. بەڵام لەم کاتەشدا هەر دەبووایە ڕۆژێک یان چەند سەعاتێک پێشتر تەلەفۆنیان بۆم بکردایە و ئاگاداریان بکردمایەتەوە! ڕێگەی چوونە ئیتاڵیا هەر ئەسڵەن لە بەرنامەدا نەبوو. سەیرە! بۆچی ڕوویان کردۆتە ئیتاڵیا؟

تانیا، دوایین جار کە لە ئەستەمبۆڵەوە تەلەفۆنی بۆ کردم، دەیگوت:

– فەرەیدوون گیان، غەمی ئێمەت نەبێ. ئێمە لێرە، لەگەڵ ماڵە پەناهەندەیەکی دیکەی کورد (ژن و مێردێکن، دوو کچی عازەب و کوڕێکی پارچەڵەشیان لەگەڵە) خانوویەکمان گرتووە و چاوەڕێی ڤیزەی سوێدی و پۆڵۆنی دەکەین. هەر هەموومان هەمان قاچاغچییەکەی ناسیاوی خۆمان کارەکانمان بۆ مەیسەر دەکا. چاوەڕوانی دەستی ئەوانین. ئەوانیش تا ئێستا هەر پێمان دەڵێن «جارێ چاوەڕێ بکەن!». هەر چۆنێک بێ، ڤیزەی هەر وڵاتێک – پۆڵۆنیا یان سوێد – زووتر بێتەوە، وابزانم ئیتر بەوێدا سەفەر دەکەین».

تەنانەت کە پێیشم گوت: «وا باشتر و خۆشترە کە یەکسەر بگەنە فڕۆکەخانەی ستۆکهۆڵم». لە وەڵامدا گوتی: «ئێمەش وا حەزدەکەین، بەڵام






ئەگەر ڤیزەی پۆڵۆنیمان زووتر بۆ بێتەوە، ئەوا بەسواری کەشتی دەگەینە سوێد. جارێ نازانین».

لە هەموو حاڵەتێک، تانیا بەهیچ شێوەیەک باسی ڕێگەی بەرەو ئیتاڵیای بۆ من نەدەکرد؟ سەیرە! تەنانەت هەر باسی محەمەد و فلۆرەنسایشی هەرگیز نەدەکرد- دیاربوو نەیدەویست متمانە بکەینە سەر محەمەد-. تۆ بڵێی تانیا لە کۆتاییدا، لەبەر خاتری ئەو ماڵە پەناهەندە کوردەی دیکە (ئەگەر ئەوان ڕایان گۆڕیبێت و حەزیان کردبێ بچنە ئیتاڵیا) ئەویش ڕای گۆڕیبێت و چووبێتە ئیتاڵیا؟ یانیش، تۆ بڵێی، لەبەر خاتری پەساپۆرتە ئەڵمانیەکەیان، یەکسەر لە ئەستەمبۆڵەوە، بێ ڤیزە، بلیتی فڕۆکەیان بەرەو ئەڵمانیا بڕیبێت و گەشتبێتنە ئەڵمانیا! دەشێ! ئەمەیان، زۆرتر ڕێی تێ دەچێت. بەڵام، ئەدی بۆچی، لە هەموو حاڵەتێکدا تەلەفۆنێکیان بۆ من نەکردووە؟ تۆ بڵێی تەلەفۆنیان بۆ کردبم و لەو دەمەدا لە ماڵ نەبووبم؟ یان پەلەیان بووبێ و فریا نەکەوتبن؛ یەکسەر بەبێ تەلەفۆن بەرەو ئەڵمانیا هەڵفڕیبن؟ خۆزگە! بەڵام لەم کاتەدا، خۆ تانیا بەهیچ شێوەیەک ئاگاداری ئەوە نییە کە محەمەدی برای، ئێستا ئەویش لە ئەڵمانیایە. تانیا – خۆیشی و باوکیشی، هەر وا دەزانن کە محەمەد لە فلۆرەنسایە. بەڵام کێ نالێ کە تانیا بەم دواییە لە ئەستەمبۆڵ خەبەر و ناونیشانی تازەی ئەوی پێ گەیشتبێت! یان محەمەد – خۆی لەناکاو تەلەفۆنێکی بۆ کردبێت؟ بەڵام محەمەد خۆ ناونیشانی تانیا نازانێ! نەخێر. هەر چۆنێک بێ، زۆرتر ڕێی تێ دەچێ کە چووبێتنە ئەڵمانیا. یانیش ئەوپەڕی، بەیەکێک لەو دوو ڕێگەیەی دایانانبوو، هاتوونەتە سوێد و نەیانتوانیوە تەلەفۆن بۆ من بکەن. ئای تانیا گیان، غەریبی و ئاوارەیی چۆن لە یەکتر دابڕی کردین! چۆن لە خۆڕایی ئەو ژیانە سادە و ئاسوودەیەی خۆمان لە خۆمان تێک دا! ئۆف! هەر چۆنێک بێ.. باش بوو: باش فریای ئەم فڕۆکەیەی کاتژمێر حەوت کەوتم!

لە بەردەم کابینەی تەلەفۆنەکە وەستابووم: چۆڵ ببێت و بچم تەلەفۆنێک بۆ هەولێر، بۆ ماڵە خەزوورەکەم بکەم. لە ناکاو، بەخۆمم گوت «ئەنجامەکەی، تەقریبەن، ئاشکرایە»، «کەواتە، بۆچی تەلەفۆن بکەم؟».




پاشان گوتم: «تازە کارتەکەم هەر کڕیوە و خەسار دەبێ. هیچ نەبێ ئەوەی پێ بڵێم کە چیتر وا نەزانن محەمەد هەر لە فلۆرەنسا دەژی».

هەر کە دەسکی تەلەفۆنەکەم بەگوێمەوە نا، دەمودەست تەلەفۆنەکەی هەولێر زرنگایەوە. خەزوورم بوو. هاوارم کرد:

– خاڵە حەمە ڕەحیم.. چۆنی..!

یەکسەر دەنگمی ناسیەوە. بەهەمان دەنگی بەرز، پێم گوت:

– محەمەدی کوڕت لە فلۆرەنسا نەماوە.

– چۆن؟

– چووە بۆ وڵاتێکی دیکە.

– بۆ کام وڵات؟

– نازانم. نازانم بۆ کام وڵات؟

خەزوورم، لەوێوە، بێ ئەوەی ئاگاداری ئەوە بێت کە من لێرە چ دەردێکم بەدەست گەڕان بەدوای محەمەدی کوڕی دیوە، پێی گوتم:

– کوڕم لە ئیتاڵیایە، هەر لە ئیتاڵیایە.

من هاوارم کردەوە:

– لە ئیتاڵیا نەماوە، لەوێ نەماوە.

دەنگی خەزوورم زۆر بەدڵنیاییەوە جەختیی لێم دەکردەوە:

– کوڕم، لە ئیتاڵیایە. من جاری پێشوو، خۆ ناونیشانەکەی ئەوم دایە تۆ. لەگەڵ برادەرێکی، پێکەوە دەژین، ناوی ڕۆژیارە.

– چووم. چووم. نەمدۆزیەوە.

– چووی بۆ فلۆرەنسا؟

– چووم. ئەو ڕۆژیارەی برادەری، دەڵێ: «ئیتاڵیای بەجێ هێشتووە».

خەزوورم درەنگ باوەڕی هات. دیار بوو ئەویش شڵەژا. لە من خەمۆکتر و سەرسامتر، لێی پرسیم:

– کەواتە ئەدی تانیا و منداڵەکان چۆن گەیشتوونەتە ئیتاڵیا؛ ئەگەر محەمەد لەوێ نەمابێ؟

– نازانم. منیش لەوە تێ ناگەم.



– بپرسە کوڕم!

– دنیام تەی کرد. نایاندۆزمەوە.

– کوڕم، من دڵنیام: تانیا و منداڵەکان گەیشتوونەتە ئیتاڵیا. قاچاغچییەکان خۆ خزمی خۆمانن، قابیلە درۆم لەگەڵ بکەن؟ بگەڕێ بەدوایاندا، ڕجات لێ دەکەم! ئەم حورمەیە و ئەو دوو منداڵە بەستەزمانە بەتەنیا لە ئیتاڵیا چ بکەن؟ بۆ کوێ بچن؟

خەزوورم سەرلەنوێ مەترسیی ئەوەی خستە دڵمەوە کە تانیا و منداڵەکانم بەڕاستی هاتبێتنە ئیتاڵیا. گوتم:

– خاڵە گیان، تۆ تەنیا من لەوەندە دڵنیا بکەوە بزانە قاچاغچییەکان چ دەڵێن!

– کوڕی خۆم، قاچاغچی ناسیاوی خۆمانە، پێرێ دیسان بینیمەوە؛ دەڵێ: «تانیا و هەردوو منداڵەکەشمان گەیاندۆتە فلۆرەنسا و داومانەتە دەست محەمەدی کوڕت لە ئیتاڵیا».

لە تووڕەیی و شڵەژان و کەللەیی خۆمدا، خەریک بوو مێشکم شەق ببات، دەمویست یەک بەدەنگی خۆم هاوار بکەم و بەخەزوورم بڵێم:

– ئاخر.. من پێت دەڵێم محەمەد لە ئیتاڵیا نەماوە!

دەمودەست، بەتوندی، دەسکی تەلەفۆنەکەم داخستەوە.

بۆ یەکەمین جار بوو لە ژیانمدا هەستم کرد: زەمین چەند فراوان و پانوپۆڕە و.. منیش چەنێک بچووک! ژیان چەنێک بێ لۆژیک و تێکچڕژاوە، ئێمەش چەنێک ساویلکە و بەدبەخت! لە دڵی خۆمدا گوتم: نەفرەت لەو ئەورووپایەی کە ساویلکەیی منی تەفرە دا !

زۆر دڵتەنگ، لەناوەڕاستی فڕۆکەخانە ئاپوورەکەی شارل دوگۆڵ، خەریک بوو لە پرمەی گریان بدەم. لەبەردەم کابینەی تەلەفۆنەکە، نائومێدانە لە خۆم پرسی:

– چی بکەم؟

بیرم کەوتەوە کە بلیتم بڕیوە:

– بۆ کوێ بچم؟ بۆ مالمۆ؟ بۆ بەرلین؟ بۆ فلۆرەنسا؟.. بۆ کوێ!

دەمزانی، بێگومان، دەبووایە بگەڕێمەوە... بەڵام نەمدەزانی بۆ کوێ؟

١٠

سپێدە، کاتژمێر هەشت و بیست دەقیقە، کاتێ دیسان، وەک هەموو ڕۆژێک، دەرگای ژوورەکەی خۆتت کردەوە؛ سەرت سوڕما، بینیت: نامەیەک، بەزمانی عەرەبی لەسەری نووسراوە «الی السید محمد حمه رحیم شوانی»، لەودیو دەرگاکەت کەوتووە.

ئەمە یەکەمین جارە «نامەیەک بەعەرەبی» بگاتە ئەم ماڵە!

ئەم نامە عەرەبییە چییە؟ کێ نامە بەعەرەبی بۆ تۆ دەنووسێ؟ چ برادەرێکی عەرەبت هەیە؟

عەلی هاشم مزعل، ئەوکاتەی لە فلۆرەنسا پێکەوە لە کۆلێژی ئەندازیاری قوتابی بوون، لەسەر داخوازیی سەفارەتخانەی عیراقی لە ئیتاڵیا، بۆ خزمەتی سەربازی، خوێندنی بەجێ هێشت و گەڕایەوە عیراق.. بەڵام دوای چوار مانگ خەبەرت بۆ هاتەوە کە لە هێرشەکەی عیراق بۆ سەر قەسری شیرین «شەهید کراوە». عەلی مزعل تاقە برادەرێکی عەرەبت بوو لە هەموو دنیا کە بەعەرەبی قسەتان دەکرد! تۆ کێی دیکەی عەرەب برادەرتە و بەعەرەبی لەگەڵ یەکتر قسەدەکەن؟

ئەوەت لەبیر چۆوە کە دیسان، وەک هەموو بەیانییەک کاتێ هیلاک و خەوالّوو لە هوتێلەکەت دەگەڕێیتەوە، هەر بەجلوبەرگەوە لەناو نوێنەکەتدا هەرەس بهێنیت.. بێ ئەوەی جلوبەرگ و پێڵاوت داکەنی، لەسەر سیسەمەکە دانیشتیت، بەپەلەپرووزێ زەرفی نامەکەت هەڵپچڕی. بەزمانی عەرەبی نووسرابوو:

بۆ بەڕێز، محەمەد حەمە ڕەحیم شوانی

ئەم کاتەت شاد،

دەزانین لە کار گەڕاویتەتەوە و ماندوویت و دەتەوێ یەکسەر بخەویت، بەڵام بۆ کارێکی پێویست کە پەیوەندیی بەژیانی خۆتەوە هەیە؛ پێویستە یەکتر ببینین و هەندێ قسە پێکەوە بکەین. بۆ ئەم مەبەستە، هەر ئەمڕۆ، کاتژمێر چواری ئێوارە، لە کافتیریای «هێر لووسیانۆ» لە بەرامبەر نافوورەکەی کۆنک شتراسە هیوادارین ئامادە بیت.



کێیە ئەم نامەیەی «بە عەرەبی» بۆت نووسیوە؟ بەعەرەبی..! ئەمە واتای وایە کە ئەو کەسە یان ئەو لایەنە عەرەبە! سەیرە!

کاتێ لە فلۆرەنسا بوویت، زوو زوو لە سەفارەتخانەی عیراقییەوە، نامەت بەعەرەبی بۆ دەهات، بانگیان دەکردیتە سەفارەتخانە و جاڕسیان دەکردیت. تۆ لە دەست ئەو بەعسییانە بوو کە غارت دایە ئێرە. تۆ بڵێی لێرەش هەر وازت لێ نەهێنن! نەخێر هیچ ماقووڵ نییە ئەمە نامەی سەفارەتخانەی عیراقی بێت. سەفارەتخانەی عیراقی لە بەرلین؟ حزبی بەعس.. لە ئەڵمانیا؟ نەخێر. نا. دوور نییە نامەی حزبێکی عەرەبی-عیراقی ئۆپۆزیسیۆن بێت! بەڵام نامەکە دەڵێ «پەیوەندیی بەژیانی خۆتەوە هەیە»! ئەم «ژیانی خۆتەوە»یە، واتای ژیانی تایبەتیم دەگرێتەوە. من چ گرفتێکم لەگەڵ چ حزبێک یان چ لایەنێک هەیە؟ کەواتە.. مەسەلەکە سیاسی نییە. نەء. ئەدی کەواتە بۆچی نووسراوە «دەزانین»، «هیوادارین». نەخێر. تۆ لە شێوازی نووسینەکەیان ورد ببەوە! بەناوی گرووپێکەوە قسە دەکەن. نووسیویانە «ئێمە». بەکارهێنانی ئەم «ین» «ین»ە، .. دەزانین.. هیوادارین... ئەوە دەگرێتەوە کە گرووپێکن یان بەلای کەمییەوە لایەنێکن کە ئەم نامەیەیان بۆ تۆ ناردووە.

دڵت، تەپ، تەپ.. خێرا لێی دەدا.

بە تەواوەتی شپرزە بوویت. چی بکەیت؟

بەڕاستی، ناخۆشە! نامەیەکت بۆ هاتووە لە لایەنێکی گومانلێکراوەوە، داوات لێ دەکا لە ڕۆژ و کات و شوێنێکی دیاریکراودا ئامادە بیت! تۆش گومانت لەمە هەیە و بەهەڕەشەیەکی دەژمێریت بۆ سەر ژیان و ئاسایشی خۆت. تەواو. مافی خۆتە و پێویستە بترسیت! کەواتە، باشترین شت ئەوەیە یەکسەر بچی خەبەری پۆلیس بدەی!

بەڵێ. بەزووترین کات بچۆرە پۆلیس و خەبەریان بدەرێ! تۆ لەدەست حکوومەتی بەعس و سەفارەتخانەی بەعسییەکان فلۆرەنسات بەجێ هێشت و غارت دایە ئەڵمانیا؟ ئایا لێرەش هەر وازت لێ ناهێنن؟ بەڵام لای پۆلیس بڵێی چی؟ چۆن بڵێی چی؟ بڵێ «نامەیەکی ئاوهام بۆ هاتووە». ئاخر کێ دەڵێ ئەم نامەیە لەم لایەنەوە هاتووە؟ بۆچی پێشتر







نامەیەکی واهییان بۆت نەدەنارد؟ بۆ نموونە یەکسەر دوای ئەوەی گەیشتیتە ئەڵمانیا؟ ئەدی ئەگەر لە حزبێکی وەک پەکەکەوە هاتبێت، یان لە حزبێکی ئۆپۆزیسیۆنی دژی حکوومەتی عیراقییەوە و بیانەوێ میوانداربیەکت بکەن.. یان ئەگەر بیانەوێ داوات لێ بکەن ببیتە ئەندامیان و کاریان لەگەڵ بکەیت؟ باشە، بەڵام تۆ کەی سیاسەتت کردووە و چی لە سیاسەت دەزانی؟ پاشان، ئەمە پەیوەندیی بە«ژیانی تایبەتیی خۆمەوە چییە»؟ سەیرە! هەر چۆنێک بێ، باشترە. زۆر باشترە کە پێش چوونت بۆ دیدارەکە، ئاگاداری پۆلیس بکەیتەوە!. بەڵێ. زۆر چاکە. ڕاستە، وا باشترە. هەر ئێستا!

ئۆف!

چ ئینسانێکی گیروگرفتاوی و نەفرەتلێکراوە.. ئەم کوردە!

ئاخر تۆ ناوی خۆتت لێرە، لە دایەرەی پەناهەندانی ئەڵمانیا، هەروەها لای پۆلیس و سۆشیاڵی بەرلین بە(سیروان حیکمەت بابان) تۆمار کردووە! تۆ ناوت سیروان حیکمەت بابانە.. لەکاتێکدا نامەکە ئاراستەی (محەمەد حەمەڕەحیم شوانی) کراوە! محەمەد حەمە ڕەحیم شوانی تۆ نیت. تۆ لەلای پۆلیس سیروان حیکمەت بابانیت!

چی بکەیت؟ پۆلیسی بەرلین و دایەرەی پەناهەندانی بەرلین لەم جۆرە حاڵەتانەدا ناتوانن بەرگریت لێ بکەن! بێگومان.

بەڵام باشە، ئەو لایەنەی کە نامەکەتی بۆ ناردووە، چۆن ناوی ڕاستەقینەی تۆی زانیوە؟ لێرە، لە بەرلین، تەنانەت لە هەموو ئەڵمانیاش، تەنیا سێ چوار برادەرێکی زۆر نزیک ناوی ڕاستەقینەی تۆ دەزانن.. ئەوانەش تەنیا ئەو ناسیاوانەتن کە لە کۆنەوە، پێش ئەوەی فلۆرەنسا بەجێ بێڵیت و بگەیتە بەرلین، دەتناسین. تەنانەت ئەوانەش هەر، ئێستا ڕاهاتوون بەسیروان بانگت دەکەن! کەواتە کێیە ئەو کەسەی ئەم نامەیەتی بۆ ناردووە؟ کێن ئەو جەماعەتەی ئەم نامەیەتیان بۆ نووسیوە؟ سەیرە! هەبێ و نەبێ، پێویستە جەماعەتێک بن کە زۆر باش دەتناسن یان پەیوەندییەکی دێرینیان بەڕابردووی تۆوە هەیە! پێویستە کەسێک یان لایەنێک بێت کە پەیوەندییان بەناو وڵاتەوە هەبێت، واتە پەیوەندییان بەو



ساڵانەوە هەیە کە تۆ لە کوردستان بوویت. بەڵێ. زۆر باش دەتناسن! بێگومان. ئەگینا ناوی تەواوی تۆ لەکوێ دەزانن؟! بەڵێ، من پێم وابێ ئەم جەماعەتە.. گومانلێکراون. ڕێی تێ دەچێ مەترسیشیان بۆ سەر ئاسایشی ژیانی تۆ هەبێت. دەبێ زۆر مقەیەت بیت! مەسەلەکەش بەبایەخەوە وەربگریت. پێش ئەوەیش بچیت بۆ ئەو دیدارە، لێی بکۆڵەرەوە و خۆتی بۆ ئامادە بکە، ئنجا بچۆ.. یانیش...! نازانم! چی بکەم؟

ئەوەیە، ئیتر.. محەمەد حەمە ڕەحیم شوانی تۆ نیت. تۆ سیروان حیکمەت بابانیت. چی بکەیت؟ ناتوانیت پەیوەندی بەپۆلیسەوە بکەیت! چونکە ئەگەر بچیتە پۆلیس و خەبەریان بدەیتێ، ئەوا ناچار دەبیت کە دانی پێدا بنێیت و بڵێیی «من ناوی ڕاستەقینەم محەمەد حەمەڕەحیم شوانی یە». دەڵێن «چۆن؟». تۆش دەڵێیی «کاتی خۆی، دە دوازدە ساڵ پێش ئەمڕۆ، کاتێ لە ئیتاڵیاوە هاتمە بەرلین، بۆ ئەوەی مافی پەناهەندەییم بۆ دەربچێت و نەزانن لە ئیتاڵیاوە هاتووم، ناچار بووم ناوی خۆم بگۆڕم و بیکەمە (سیروان حیکمەت بابان)».

بێگومان لەوکاتەدا دۆسیەیەکی دیکەم بۆ دەکەنەوە و .. ئنجا ئەو کاتەش.. بێگومان .. گرفتێکی دیکەم بۆ دروست دەبێت و نازانم سزاکەی چییە؟

نەخێر، ناکرێ. وا باشترە جارێ پەیوەندی بەپۆلیسەوە نەکەم!

تۆ بڵێیی ئەم نامەیە، هەر خۆی، لەلایەن پۆلیسی ئەڵمانی و دایەرەی پەناهەندانەوە نەهاتبێت: بیانەوێ ناوی راستەقینەی خۆمم پێ ئاشکرا بکەن؟ خۆ هەموو شتێک دەبێ.

هەر بەجلوبەرگ و پێڵاوەوە، لەسەر پشتت، لەسەر سیسەمەکە راکشابوویت، ڕووت لە بنمیچی ژوورەکە، پەنجەکانی هەردوو دەستت لەناو یەکتر لەسەر نێوچەوانت لێک بەستبوون و.. بیرت دەکردەوە.

نەخێر، ئەگەر پۆلیس یان سۆشیاڵی بەرلین بووایە، بانگیان دەکردیتە نووسینگەی خۆیان. ئەم شێوازە، دیارە، شێوازێکی «ئیستیخباراتی» و تۆقێنە.

لە ناکاو، سوکنایییەک بەدڵتدا هاتەوە:

تۆ بڵێی برادەرەکانی خۆت نەبن، بیانەوێ گاڵتەیەکت لەگەڵ بکەن؟ فوئاد خەبیر؟ شێروان شەپقە؟ بەڵێ. ئەمە لە ئیشی «فوئاد» دەچێ. جارێکیشیان حەمەلاوی بەستەزمانی لە بەرلینەوە ڕاپێچ کردبووە شتووتگارت، گوایە دایک و باوکی حەمەلاو کوردستانیان بەجێ هێشتووە و گەیشتوونەتە شتووتگارت داوای پەناهەندەیی دەکەن و.. پێویستە حەمەلاو بگاتە شتووتگارت: ئەمە بەس بۆئەوەی حەمەلاو بگاتە لایان و لە سەیرانە جەماعییەکەیاندا گۆرانییان بۆ بڵێت و گۆڵمەزەکەیان خۆشتر بکات! پاشانیش، بەفوئاد و هەموو برادەرەکانییەوە، پارەی هاتوچۆکەیان دابووەوە. فوئاد و شێروان تا ئێستاش ئەم ڕابواردنە بەحەمەلاو، وەک نوکتەیەکی خۆش بۆ یەکتر دەگێڕنەوە!

نامەکەت جارێکی دیکەش خوێندەوە. بیرت کردەوە: «دەزانین لە کار گەڕاویتەوە و ماندوویت و دەتەوێ یەکسەر بخەویت».

دەبینی: باش دەتناسن! باش ئاگادارتن! تەنانەت پێشتر بەتەواوەتی لە جەدوەلی ژیان و کارت وردبوونەتەوە. کەچی ئیمزا و ناوی خۆشیان نەنووسیوە. تەنانەت بەپیتێکیش!

ماقووڵە ئەڵمانیاش بەجێ بێڵێت و غاربدەیتە وڵاتێکی دیکە؟

کە بیری لێ دەکەیتەوە، پێکەنینت دێ. زیاتریش لە گۆڵمەزێکی برادەرانە دەچێت..!

کافتیریای هێرِ لووسیانۆ، بەرامبەر نافوورەکەی کۆنک شتراسە، کە دەکەوێتە ناوەڕاستی شاری بەرلین...

ماقووڵە لە ناوجەرگەی یەک دونیا خەڵک و قەرەباڵغیی خەڵکی بەرلین، بەبەرچاوی ئەو هەموو خەڵکەوە بتکوژن یان شتێکت لێ بکەن؟

بڕیارت دا: باشتر وایە بچیت!







١١

لە پاریسەوە، لە فڕۆکەخانەی شارڵ دوگۆڵەوە، بەدوو کاتژمێر و شتێک گەیشتمە ستۆکهۆڵم.

من عادەتمە: کاتێ گرفتێکی سەختم دەبێت، یەکسەر سەرم دەکەوێتە ژان و نەخۆش دەکەوم. لەناو فڕۆکەوە، بەئاسمانەوە، ئەو سەریەشەیەم دەستی پێ کردەوە.

کاتێ دەگەمە ستۆکهۆڵم و بلیتی گەڕانەوە بۆ مالمۆ دەبڕم، دوای یەک دوو جەم نانخواردنی دیکەش.. ئیتر تەواو: پارەم پێ نامێنێ. لە مالمۆ، بیردەکەمەوە: نازانم هەندێک پارە لە کێ بەقەرز وەربگرم؟

غەریبیی تانیا و منداڵەکان خەریکە دەمکوژێ.

١٧ یان ١٨ی نیسان

١٢

لە دەوری مێزێکی قوژبنی کافتریاکە، جگەرەیەکت داگیرساندبوو. بەدیار قاوەکەتەوە چاوەڕێت دەکرد.

کافتریاکە هێندە قەرەباڵغ نەبوو. لە دەستەڕاست: دوو مێز، هەر یەکێکیان سێ چوار کچ و کوڕی ئەڵمانیی بەدەورەوە، لە ناوەڕاستیش سێ چوار مێزی دیکە، کە هەموویان بەتاڵ بوون. دوو منداڵیش لە نزیک کۆنتوارەکە خەریکی یاریکردنی ئەتاری بوون.

بارمانی کۆنتوارەکە، سەرقاڵ، بەپەڕۆیەک پەرداخەکانی پاک دەکردەوە، لە ناکاو دیتی: پیاوێکی شەپقە ڕەشی پاڵتۆ ڕەشی پێڵاو شین.. زۆر لەسەرخۆ هاتە ژوورەوە.

پیاوێکی شەپقە ڕەشی پاڵتۆ ڕەشی پێڵاو شین، هەر دوو دەستی لەناو گیرفانی پاڵتۆ، تەماشایەکی ناو کافتیریاکەی کرد و یەکسەر، کاتێ چاوی کەوتە سەر تۆ، وەک ئەوەی بتناسێت یان پێشتر تۆی بینیبێت، بەرەو مێزەکەی تۆ هات:







– مەرحەبا!

تۆش، هەر بەعەرەبی:

– ئەهلەن وە سەهلەن.

زۆر بەحورمەتەوە لەگەڵت دووا:

– ئیزنم دەدەی؟

دەیویست کورسییەکە ڕاکێشێت بۆ لای خۆی و لەلات دانیشێت.

– فەرموو! بێگومان.

کاتێ دانیشت، پێش هەموو شتێک شەپقە ڕەشەکەی لەسەر مێزەکە دانا. پاشان پەنجەکانی هەر دوو دەستی، لە شێوەی پەرژینێک، لەناو یەکتر بەست.. لەسەر مێزەکە، بەرامبەر خۆی داینان.

بڕۆی ڕاستی، لێت بەرزکردەوە، گوتی:

– تۆ ناوت چییە؟

تۆ، ڕاستییەکەی، ترسایت. ئایا ناوی ڕاستەقینەی خۆتی پێ بڵێیت یان نا؟ لەوە دەترسایت کە ئەم پیاوە ناوە ڕاستەقینەکەت لەلای پۆلیس و سۆشیالی ئەڵمانی بدرکێنێت و تووشی مەحکەمە و سزادان ببیت؛ لە دیاهیشدا دۆسیەی پەناهەندەییت هەڵبوەشێتەوە و ناچار ببیت بەرەو ولاتێکی دیکەی ئەورووپا ئاوارە ببیتەوە.

نەتدەتوانی دەمودەست وەڵامی بدەیتەوە. باش بوو، شاگردی کافتیریاکە، بەخۆی و بەروانکەیەکی نارنجییەوە، زەردەخەنەیەکی بۆ کردن.

تۆ بەکابرای پاڵتۆ ڕەشت گوت:

– قاوەیەک ناخۆیتەوە؟

کابرا گوتی:

– نەخێر. من تەنیا ئێواران، دوای نانخواردن قاوەیەک دەخۆمەوە.. ئەویش ئەگەر خواردەمەنییەکی ئەوتۆم خواردبێت کە سەوزەواتی زۆر لەگەڵ بووبێت.

شاگردەکە، کەمێک بۆ کابرای پاڵتۆ ڕەش دانوشتایەوە:

– هێر..!



کابرای پاڵتۆ ڕەش بەئەڵمانییەکی ئەوتۆ، کە دیاربوو ساڵانێکی زۆر لە ئەڵمانیا ژیاوە و باش فێری زمانەکە بووە، بەشاگردەکەی گوت:

– چایەکی تیزان بۆ من بێنە، بەڵام کەم شەکر و زۆر سووک!

تۆ ئەمە یەکەم جار بوو لە ژیانتدا لەگەڵ کەسێک دانیشیت داوای چای تیزان بکات. ئەم پیاوە کێیە؟ چیی لە من دەوێ؟ بیرت دەکردەوە: بڵێم ناوم چییە؟

– بۆچی؟

گوتی: چی بۆچی؟

گوتت: بۆچی لە ناوی من دەپرسی؟

پیاوە پاڵتۆ ڕەشەکە، بەزەردەخەنەیەکەوە، بەڵام زۆر جیددی و پڕ ویقاڕ:

– حەزدەکەم یەکتر بناسین.

کە ئەمەی گوت. ددانە درشتە زۆر سپییەکانی، لەودیو لچ و لێوە پاک و تراشراوەکانیەوە بەدیار کەوتن. بەدیالێکتێکی عەرەبیی عیراقییانەی تەواو قسەی دەکرد. پیاوێکی تا بڵێی کۆک و پاک و تەمیز و «جەنتڵمان» دیاربوو. لەوە دەچوو تەمەنی دەوروبەری پەنجا ساڵێک بێت. جەنتڵمانییەکەی ئەم، هەروەها جیاوازیی نێوان تەمەنی خۆت و ئەو، زیاتر وای لێ دەکردیت ڕێزی بگریت.

لێت پرسی: تۆ دختۆری؟

پێکەنی، گوتی:

– بۆچی؟ لەبەرئەوەی گوتم «من قاوە تەنیا دوای نانخواردنی ئێواران دەخۆمەوە.. ئەویش ئەگەر سەوزەواتم زۆر لەگەڵی خواردبێت»؟

تۆ حەزت کرد دەمودەست لێی بپرسی:

– جەنابت چیت لە من دەوێ؟

کابرای پاڵتۆ ڕەش نەرم نەرم پێکەنی.

– پێم بڵێ، تکایە، بزانم: جەنابت چیت لە من دەوێ؟

کابرای پاڵتۆ ڕەش گوتی:

– دەمەوێ ئیشمان لەگەڵ بکەی!

– ئیشی چی؟

لە ناکاو گوتی:

– تۆ لەو هوتێلە.. مانگانە چەند وەردەگری؟

نەیهێشت وەڵامی بدەیتەوە، گوتی:

– دوو هەزار و پێنج صەد مارک.. بەشی چیت دەکا؟ یەک شەو بچیتە نایت کلەبێکەوە و تەواو!

ئەو، چونکە دڵنیا بوو لەوەی کە تۆ ناتوانیت قسەکانی بەدرۆ بخەیتەوە، درێژەی پێدا:

– تۆ ئەوە دە دوازدە ساڵە لە بەرلین دەژیت، چەند جار سەرت کردووە بەنایت کلەبێکدا؟ چەند جار پێکێک ویسکی یان براندی یان شەمپانیات خواردۆتەوە، یان تەنانەت بوتڵە شەرابێکی سوورت کڕیوە و بەئاسوودەییەوە نۆشت کردووە؟! چەند سەفەرت کردووە؟ چەند دنیا گەڕاوی؟ چەند قەراغ رووبارت دیوە؟ چەند ئاهەنگ و سینەما و شانۆ و مێزی ڕازاوەت دیوە؟ چەند جار؟ لەگەڵ چەند کچی ئەڵمانی نوستوویت؟ خۆ تۆ هێشتا هەر گەنجیت! جارێ تازە هەرەتی لاویتە. مافی خۆت نییە؟

تۆ سەرت لەم پرسیارە لەناکاوانەی کابرا سوڕ ما. بۆچی ئەم پرسیارانەت لێ دەپرسێت و بۆچی دەیەوێ تێکەڵ بەژیانی تایبەتیت ببێ؟

کابرای پاڵتۆ ڕەش بواری نەدایتێ بیر لە شتی تر بکەیتەوە، تەنیا لەو پرسیارانە نەبێ کە بۆ خۆی دەی وروژاندن لە مێشکتدا:

– ئایا مافی خۆت نییە، لێرە، وەک هەر ئەڵمانییەک، ژیانێکی ئاسوودە و پڕ کەیف و سەفای وەک ئەوانت هەبێت؟! ئەمە مافێکی هەرە سادە و ڕەوای مرۆڤ نییە کە ئاوها، وەک ئەوان بژیت؛ لە ئاسوودەیی دەوروبەری خۆی چێژ وەربگرێت؟ بەکورتی.. بژیت!

تۆ، ئەگەرچی نەتدەویست درۆی لەگەڵ بکەیت و دەتزانی هەموو قسەکانی ڕاستن، بەڵام گوتت:

– من ئەوەندە بیر لەم شتانە ناکەمەوە.

کابرای پاڵتۆ ڕەش، بەوپەڕی متمانە و دەربڕینی خۆشەویستییەوە قسەی



بۆ دەکردیت:

– ئەم دوو هەزار و پێنج صەد مارکەی وەری دەگریت، نیوەی دەدەیتە کرێی خانوو. وایە؟

– وایە.

– سێ صەدی دەدەیتە میترۆ و پاص و هاتوچۆ. وایە؟

– وایە.

– پێنج صەدی دەدەیتە جگەرە...

– وایە.

– ئەوەی دەمێنێتەوە تەنیا بەشی ئەوەت دەکا کە لە برسان نەمریت. ئایا گەنجێکی قۆزی وەک تۆ، لەم ئەورووپایە، ژیانت تەنیا ئەوە بێت کە تەنیا لە برسان نەمریت!؟ ئەمەیە فەلسەفەی تۆ و هەموو پەناهەندەیەکی دیکەی ئەم ئەورووپایە؟ دوور لە هەموو خۆشی و ئاسوودەیی و لەززەتێکی ئەم دنیایە، لەناو قۆزاغەی هەژاریی پەناهەندەییدا؛ تەنانەت ناچارن ئەوەش قبووڵ بکەن ئەگەر گەنجێکی خوێڕیی ئەڵمانی، هەر کاتێک بیەوێ تفێکیشتان لێ بکات!

پاشان لە ناکاو، ئەو نەرمی و میهرەبانییە لە قسەکانی نەما. توند و باوکانە، کەوتە ئامۆژگاری کردنت:

– گوێ بگرە! تۆ دەبێ ژیانی خۆت بگۆڕیت!

تۆ بیرت دەکردەوە. بۆچوونەکانت وەک ڕەوە ئەسپێکی زندانکراو کە تازە ئازاد کرابن، لەدەستت ڕایان دەکرد. فریای ڕێکخستنی بۆچوونەکانی خۆت نەدەکەوتیت. دەتویست لێی بپرسیت: «چۆن یەعنی؟». گوتت:

– ئێوە حزبتان هەیە؟

– نەخێر.

دەتویست بەڕاستی لەگەڵ ئەم پیاوە بچیتە ناو گفتوگۆیەکەوە. لێت پرسی:

– لە ڕێکخراوی دژی ڕاسیسم کاردەکەن؟

– نەخێر.





– ئەدی باشە، ئامانجتان چییە؟

کابرای پاڵتۆ ڕەش گوتی:

– ئێمە دەمانەوێ، خەڵکی وەک تۆ بتوانێ تام لە خۆشییەکانی ئەورووپا وەربگرێ، چێژ لە دنیای ئێرە ببینێ، پڕ بەهەموو سییەکانی خۆیەوە بۆنی جوانی و ئاسوودەیی بکات؛ بۆنی ژیان بکات.. بۆ ئەوەی کاتێ تەمەنی گەیشتە پەنجا ساڵ (واتە دوای دە دوازدە ساڵی دیکەی تۆ) بەخۆی بڵێیت: «بەڕاستی، من دانی پێدا دەنێم: من تێر ژیام..».

لێت پرسی:

– تۆ لە بەرلین دەژی؟

– نەخێر.

سەیرە! تۆ نەتدەزانی چۆن لەم پیاوە دەربێنیت کە ئاخۆ بەتەواوەتی چیی لە تۆ دەوێ؟ بەڵام، لە هەمان کاتدا زۆریشت پێ خۆش بوو کە گوێ لەم قسە جوانانەی ڕابگریت.

پایپە درێژە گرنج گرنجە بریقەدارەکەی– کە لەوە دەچوو زەرکەفت کرابێ.. لە دەمی دەرهێنا، گوتی:

– تۆ ئەورووپییەکان دەناسیت: تا تەمەنیان دەگاتە چل ساڵ، بەلای کەمییەوە هەشت وڵات گەڕاون، بیست شاریان دیوە، پەنجا کچ و ژنیان ناسیوە، سەدان دیسکۆ و سینەما و شانۆ و مەلها و قەراغ ڕووبار و شوێنی خۆشی دیکەیان دیوە. ماڵی خۆیان هەیە، ژیان و شەخسییەتی خۆیان هەیە.. دەژین.. بەمانای وشە، دەژین. ئەم ژیانە بەچی دەکرێ! بەچی دەکرێ؟ پێم بڵێ!

کاتێ کابرا گوتی: «بە چی دەکرێ، پێم بڵێ!» بەئەنگوستیلە گەورە زێڕەکەی، کە مووروویەکی بچکۆڵەی درەوشاوەی مۆری لەسەر بوو، تەق، لە مێزەکەی بەردەم خۆی دا. دەنگی تەققەی ئەنگوستیلەکە بەتەواوەتی ڕایچڵەکاندیت. گوتت:

– بەپارە!

دەمودەست گوتی:



– ئەو ژیانە خۆشەی ئەورووپییەکان، بەو چوڕکە پارەیەی هوتێلەکەی تۆ؛ یان بەو چوڕکە پارەیەی لە سۆشیاڵ وەری دەگرن.. مەیسەر دەبێ؟

دیسان بەئەنگوستیلە زێڕە خڕەکەی، تەق.. لە مێزەکەی دایەوە:

– مەیسەر دەبێ؟

گوتت: نەخێر.

– دە، کەواتە، دەبێ لەمەودوا بیر لەوە بکەیتەوە کە چۆن بتوانیت بەڕاستی بژیت!

– وایە...

– ئەورووپاییەکان، تۆ ئەوە لەبیر نەکەیت: بەپارە و سامانی ئێمە ئەم ئەورووپایەیان بۆ خۆیان دروست کردووە!

گوتت: چی؟!

– ئەورووپاییەکان.. بەپارە و سامانی ئێمە ئەم ئەورووپایەیان بۆ خۆیان دروست کردووە!

ئنجا مەبەستی قسەکەی خۆی ڕوونتر کردەوە:

– بەنەوتی ئێمە و لەسەر حیسابی ئێمە کۆشک و تەلارەکانی خۆیان دروست کردووە. بەسەروەت و سامانی ئێمە توانیویانە بگەنە ئەم ژیانە خۆشەی لێرە بۆ خۆیان دروستیان کردووە.

تۆ دەتویست بپرسیت: چۆن؟

– ئەگەر ڕۆژهەڵات نەبێ؛ ئەورووپا دەبێ وەک سەدە تاریکەکانی ناوەڕاست، بگەڕێتەوە سەر ئەوەی کە پاشا و پاپا و میرەکانیان دیسان «پسوولەکانی لێبوردن» لە ڕێگەی کەنیسەکانەوە بۆ خۆیان دروست بکەن.. دیسان دەست بکەنەوە کۆیلە کردنی ڕۆڵەکانی خۆیان و.. دووبارە هێرش کردنەوە سەر ئەو قەڵا شکۆمەندانەی کە سەلاحەدینی ئەییووبی لە ڕۆژهەڵاتدا دروستی کردبوون!

ئنجا پێکەنی:

– خۆ هەر لە ئێستاشەوە، دەستیان کردۆتە ئەم هێرشانەیان!

«ئەم پیاوە باسی چیم بۆ دەکا؟!»

– خۆ تۆ کەم تا زۆر لەوانەیە کەمێک ئاگات لە دنیای سیاسەت هەبێ! سامان و بیرە نەوتەکانی ئێران و عێراق و تورکیا و سووریا و کوێت و جەزائیر و میرنشینەکانی دیکەی خەلیج و سعوودیەیان «بە چی» بۆ خۆیان پەلکێش کردووە؟ بەپارە! بەپارە. لەسەر حسابی ئێمە کڕیویانە! تۆ بزانە؛ لەسەر «کوێت» کردیانە چ شەڕێک! پەنجا شەست دەوڵەتی ئەورووپا پێکەوە.. کردیانە چ هەرایەک؟ کوێتیان (بە چی) کڕییەوە؟ بەپارە. بەپارەی ئێمە. ئەمە شتێکی بەڵگەنەویستە کە ئەورووپا لەسەر حسابی ئێمە و بەسەروەت و سامانی ئێمە دەژیت! «ئێمەی پەناهەندە» کەواتە مافی خۆمانە، لێرە، بەشێوەیەکی یەکسان، وەک ئەوان بژین و چێژ لە ژیانی ئاسوودە و خۆشی ئەورووپا وەربگرین. بەڵام ئەم ژیانە، چۆن، بەچی مەیسەر دەبێ؟

تۆ لە وەڵامدا، بێ ئەوەی پێویستیت بەبیرکردنەوە هەبێ، گوتت:

– بەپارە.

– تەواو!

ئەنگوستیلە زێڕە خڕەکەی، دیسان لە مێزەکە دایەوە و گوتی:

– دە کەواتە، کاک سیروان، تەواو؛ لەمەودوا دەبێ بیر لەوە بکەیتەوە کە چۆن تۆش ئەوەندە پارەیەت دەست بکەوێت کە بتوانیت تێر، لە خۆشی و ئاسوودەییدا، وەک ئەوان بژیت.

تۆ، لە قسەی دیماهیدا، تێبینی ئەمەت کرد کە گوتی «کاک سیروان». ناوی دووەمیشت دەزانێ! چۆن؟ زەردەخەنەیەکی دۆستانەت بۆی کرد، گوتت:

– تۆ لە سەرەتای دانیشتنماندا خۆت وا نیشان دا کە ناوی من نازانیت و لێمت پرسی «ناوت چییە؟».

بە زەردەخەنەیەکی وەک گاڵتە پێکردنەوە، وەک ئەوەی وا نیشان بدات کە ئەو لەوسەرەوە دێتەوە، گوتی:

– «محەمەد حەمەڕەحیم شوانی».

پاشان یەکسەر لێتی پرسی:







– ئەم ناوەت چۆن دۆزییەوە؟

– کام ناو؟

– محەمەد حەمەڕەحیم شوانی.

پاشان گوتی:

– مەبەستم: کێ ناوتی ناوە «محەمەد»؟

تۆش گوتت:

– بێگومان باوکم.

– نەخێر.

– چۆن؟

– خۆت ئەم ناوەت لە خۆت ناوە.

ئنجا پێکەنی:

– ئەدی کێ ناوتی ناوە «سیروان حیکمەت بابان»؟

بێ بیرکردنەوە گوتت:

– خۆم.

کابرای پاڵتۆ ڕەش گوتی:

– نەخێر.

– چۆن؟

– واتە: دەبێ باوکت ناوتی لێ نابێ «سیروان» و خۆت ناوت لە خۆت نابێ «محەمەد».

گوتت:

– نەخێر، ڕاستییەکەی، بەتەواوەتی بەپێچەوانەوەیە: باوکم ناوی لێ ناوم «محەمەد» و خۆم ناوم لە خۆم ناوە «سیروان».

پاشان گوتت:

– ئەمەش نهێنییێکە، کە پێویستە تەنیا لەنێوان خۆماندا بمێنێتەوە.

– ئۆو... زۆر پێم خۆشە کە هێندە متمانەت بەمن هەیە. بێگومان زۆر نهێنیی دیکە هەن کە لە داهاتوویەکی نزیکدا دەکەونە نێوانمانەوە. غەمی ئەوەت نەبێ!




کابرای پاڵتۆ ڕەش، بەدرێژایی ئەو هەموو ساتەی قسەی بۆ دەکردیت، بێ ئەوەی هیچ تەکلیفێکیش لە خۆی بکات، یەک چرکە چییە نەیهێشت ڕەوتە جەنتڵمانییەکەی خۆی لە دەست بدات. بەهەمان ڕیتم، نەختێک هەڵسایەوە بۆئەوەی جێگەی خۆی خۆشتر بکات، کورسییەکەی ڕاکێشایە دواوە و لەسەری دانیشتەوە. گوتی:

– دەی.. هەر چۆنێک بێ، من زۆر قسەم کرد. ئنجا نۆرەی تۆیە؛ هەندێ قسەم بۆ بکە!

– بلێم چی؟

– تۆ بۆچی نایەیت ئیش لەگەڵ ئێمە بکەی؟

دوای ئەم هەموو گفتوگۆیە، تۆ نەتدەتتوانی بەجیددی و بەمتمانەوە قسەی لەگەڵ نەکەیت، گوتت:

– ئێوە کێن؟

کابرای پاڵتۆ ڕەش، هەردوو لا چاکەتەکەی وێک هێنایەوە سەر سنگی، گوتی:

– تۆ چیت.. ئێمەش ئەوەین!

تۆ بیرت دەکردەوە؛ لە قسەکانی حاڵی نەدەبووی. من چیم؟!

ئەو گوتی:

– دەزانی جیاوازیی تۆ لەگەڵ ئێمە چییە؟

– چییە؟

– تۆ بەتەنیای؛ بەڵام ئێمە دەستەیەکین. تۆ لە سەرەتای خۆ دامەزراندنی خۆتدایت، بەڵام ئێمە هەر لە سەرەتای ڕاپەڕینەوە دامەزراوین.

تۆ بەڕاستی پێکەنینت بەقسەکانی دەهات. گوتت:

– چ جیاوازییەکی دیکەش؟

گوتی:

– تۆ هەژار و بێ دەرەتانیت؛ ئێمە دەوڵەمەند و بەهێزین.

ئنجا گوتی:

– هەر بۆیەش دەمانەوێ یارمەتیت بدەین، دەوڵەمەند و بەهێزت بکەین!



– چۆن؟

– بێیتە ناومانەوە. پەیوەندیمان پێوە بکەیت.

پەنجەی شایەتمانیشی لێم بەرزکردەوە. ئەنگوستیلەکەیم دیت لە پەنجەی، ڕاوەشا:

– گوێ بگرە! ئەمە تەنیا بڕیاری یەکێک و دووانمان نییە.

هەستم کرد هەڕەشەم لێ دەکا، گوتی:

– لەو ڕەفتارەی بەم دواییەش کردووتە؛ خۆش دەبین! بەتەواوەتی لێت خۆش دەبین.

کابرای پاڵتۆ ڕەش، یەکسەر ئادگاری، شێوەیەکی دیکەی وەرگرت. دووبارە خستییەوە هەمان ئەو گومانەی کە لە سەرەتادا بەرامبەری هەتبوو. گوتت:

– ڕەفتاری چی؟

– شەش هەزار و پێنج صەد دۆلاری ماڵی حەمە ڕەحیم شوانی!

– باوکم؟

دیسان بێ ئەوەی ڕەوتی جەنتڵمانییەکەی خۆی لە دەست بدات، بەدەنگی بەرز، بەچەند قۆناغێک پێکەنی:

– بە.. لێ... باو.. کت!

پایپە درێژە گرنج گرنجەکەی لە دەمی هێنایە دەرەوە و فوویەکی کرد:

– «حەمە ڕەحیم شوانیی باوکت»!

ئنجا گوتی:

– گوێ بگرە، من بۆ ئەوە نەهاتوومە لات داوای ئەم شەش هەزار و پێنج صەد دۆلارەت لێ بکەمەوە!. تەواو. تەنانەت بەناوی هەموو برادەرەکانی خۆشمەوە پێت دەڵێم «ئافەرین».

– ئافەرین بۆ چی؟

– بۆ ئەوەی توانیوتە ئەو برە پارەیەی ئەو ژنە بەستەزمانە، بەو زیرەکی و بەو ئاسانییەوە وەربگریت و تێیشی بتەقێنیت بەرەو بەرلین بگەڕێیتەوە!

– ژن کێ؟

– تانیا.

– تانیا کێ؟

– تانیای کچی حەمە ڕەحیم کەرکووکی. تۆ نازانیت کچی کێیە. کابرای کەرکووکی، هەڵبەتا، خزمی یەکێک لە برادەرەکانی خۆشمان بوو. ئەمە یەکەمین جارە شەرمەزاری خەڵک بین.

تۆ، سەرسوڕماو، ئەبڵەق ببوویت. لێت پرسی: تانیا حەمە ڕەحیم کەرکووکی؟!

– بەڵێ.

پێت گوت: تانیا خوشکی خۆمە؛ خوشکی منە...

– ئێمە دەشزانین کە تۆ ئەمە دووەمین جارە ناپاکی لەگەڵ ئێمە دەکەیت. تۆ خەتێکی کاری ئێمەت کەشف کردووە...

– حەمەڕەحیم کەرکووکیش، باوکمە.. باوکی خۆمە.

کابرای پاڵتۆ ڕەش، بەشێوەیەک کە زیاتر لە هەڕەشە دەچوو، گوتی:

– گوێ بگرە، کاک سیروان، ئەم سیناریۆیە تەواو بوو. تۆ پرسیت:

– سیناریۆی چی؟

کابرای پاڵتۆڕەش گوتی:

– ئێمە لێت خۆش دەبین ئەگەر بڕیاربدەی لە گەڵمان ئیش بکەیت.

– من پێش هەموو شتێک ناوم «سیروان» نییە..

کابرای پاڵتۆ ڕەش گوتی:

– شوورەییە بۆ من (کاری منیش نییە) داوای ناسنامەکەت لێ بکەم و بزانم ناوت چییە! هەموو کەسێک دەزانێ ناوت چییە.

– کاکە، من یازدە ساڵ زیاترە ناوی خۆم کردۆتە سیروان. ناوی خۆم...

کابرای پاڵتۆ ڕەش بەهەڕەشەوە ئەنگوستیلە زێڕە خڕەکەی کێشا بەمێزەکە:

– بیبڕەوە، سیروان....!

ئنجا نەختێک دەنگی بەرزکردەوە و چاوی لێت زەق کردەوە:

– تۆ وا تێ دەگەی لەگەڵ هەمان ئەو کەسە قسە دەکەیت کە شەش هەزار







و پێنج صەد دۆلارەکەت لێی وەرگرتووە؟! ئەو، خەشیمێک بوو..

– «ئەو» کێ؟

کابرای پاڵتۆ ڕەش تووڕە بوو:

– شەخسێک! «تۆ دەیناسی»!

– چیی کردووە؟

– بەتانیای حەمە ڕەحیم کەرکووکیی گوتووە «من برادەری محەمەدی براتم..».

– ئێ؟

– پێی گوتووە: «محەمەدی برات گوتوویەتی: ئەو پارەیە بدەیتە من بۆ ئەوەی بیدەم بەبرات، کە ئەویش بیداتە قاچاغچییەکان». باشە!

– ئێ؟

– ئەو ژنە بەستەزمانەش، جوان جوان، پارەکەی داوەتە دەست ئەو کەسە. ئەو کەسە قۆڵبڕەش «شاگردی تۆیە»؛ «شاگردی ئێمە» نییە.. بەقوربان. ئێستا تێگەیشتیت؟ تێگەیشتیت کە ئێمەش باش تێگەیشتووین؟!

تۆ خەریک بوو مێشکت ڕادەوەستا، لەبەرئەوەی دەتزانی کە ئەم پیاوە بەجیددی و بەڕاستییەوە باسی «کارەساتێک» دەکا کە پەیوەندیی بەتانیای خوشکتەوە هەیە. پرسیت:

– ئەمە لە کوێ؟

– لەسەر سنووری ئیتاڵیا.

– یەعنی تانیای خوشکم هاتۆتە ئیتاڵیا؟

– بەڵێ «تانیای خوشکت» هاتۆتە ئیتاڵیا و.. گەڕاندرایەوەش!

– چۆن؟

– **تۆ** دەزانی چۆن!

تۆ خەریک بوو وردە وردە لە «کارەساتەکە» تێدەگەیشتیت.

– من ئێستا ئەوەشم بۆ دەرکەوت کە تۆ هەمان ئەو کەسەی کە دوو مانگ پێشتریش هەمان دەستەگوڵت لەگەڵ ژن و مێردە خانەقینییەکەش

لێ دابوو. لەوەشت هەر خۆش دەبین...

هەوڵت دا کۆنترۆڵی دەمارگرژی و شڵەژانی خۆت بکەیت، گوتت:

– تکات لێ دەکەم، ئەگەر دەرچوونی تانیام بۆ ئیتاڵیا لە نووکەوە بۆ باس بکەیت؛ بەڵێن بێ منیش هەرچی دەتەوێ بیکەم!

– یەعنی چۆن؟

– بۆم باس بکە: ڕووداوەکە بەتەواوەتی چۆن بووە؟ لە کوردستانەوە تا دەگاتە سەر سنووری ئیتاڵیا!

کابرای پاڵتۆ ڕەش دەستێکی لە شەپقە ڕەشەکەی خۆی دا، گوتی:

– گوێ بگرە، کاک سیروان؛ تۆ باش دەزانی: ئەم شەش هەزار و پێنج صەد دۆلارە، تەنیا بەشی دوو مانگت دەکا. بەڵام ئەگەر تۆ بڕیار بدەی لەگەڵ ئێمە کار بکەیت؛ بەبەردێک دوو چۆلەکە دەکوژیت. یەکەم: وا لە ئێمە دەکەیت کە لێت خۆش ببین.. لە هەرچی کردووتە و بردووتە خۆش ببین. دووەم: لەمەودوا، لەمڕۆوە، ژیانت دەبێتە ژیانی هەر جەنتڵمانێک لێرە، لە ئەورووپا.

بەکابرات گوت: «باشە!»، «بەڵام با جارێ بزانم ئێوە کێن؟».

بەدەنگێکی نزمتر، بەڵام بەمتمانەوە، دانی بەوشەکانیدا دەگرت:

– ئێمە، دەستەیەک قاچاغچیی ئەنتەرناسیۆنالین. دەزانی «ئەنتەرناسیۆنال» چییە؟

– بەڵێ.

– یەعنی لە هەولێرەوە تا دەگاتە ئیبراهیم خەلیل و تاران و ئەستەمبۆڵ و ئەسینا و قوبرس و بوخارست و وارشو... تەنانەت ئەندام و کادر و شاگردمان لە ڕۆما و ئەمستردام و لەندەن و دوبەی و فلۆرەنسا و پاریس و ... تەنانەت لە بەرلینیش هەیە. پایتەختی وا هەیە سێ ئەندام و شاگردی ئێمەیان تێدایە.

تۆ زۆر جاران لە شاشەی تەلەفزیۆنەوە ڕیپۆرتاژی فراوانت دەدی لەبارەی تاقمی قاچاغچییەکانی حەشیشە کە لە نێوان ئەفغانستان و کۆڵۆمبیا و ئەورووپا کاردەکەن. پرسیت:







–ئێوە قاچاغچێتیی چی دەکەن؟

– وەکو پێم گوتی: «ئێمە دەمانەوێ خەڵک بۆ خۆی بتوانێ تام لە خۆشییەکانی ئەورووپا وەربگرێ؛ ئێمە خەڵک لە کوردستانەوە دەگەیەنینە ئەورووپا و ئەمریکا.. بۆ ئەوەی بۆ خۆیان دنیا ببینن، فێری ژیان ببن، چێژ لەو هەموو جوانی و خۆشییەی ئەورووپا وەربگرن.. لەو وڵاتانەدا بۆ خۆیان بتوانن کار بدۆزنەوە و پارە بۆ خۆیان کۆبکەنەوە!

ئەوەتا: کابرای پاڵتۆ ڕەش بەتەواوەتی بۆ ئەوە هاتۆتە لات کە بتهێنێتە ناو تاقمەکەی خۆیانەوە و بتکاتە ئەندامی خۆیان. بەڵێ. لەوە دڵنیابە! بەڵام تانیای خوشکت پەیوەندیی بەم مەسەلەیەوە چییە؟ ئەم چیرۆکەی تانیای خوشکت چییە دروستیان کردووە؟

لێت پرسی:

– ئێوە حزبن؟

– نەخێر، بەڵام لە حزب باشتر توانیومانە خزمەتی خەڵکی کوردستان بکەین!

– چۆن؟

– ئایا لە ماوەی تەنیا سێ مانگدا، کێ توانیویەتی زیاتر لە ۳۵۷۰۰ کەس بگەیەنێتە ئەورووپا؟ ئایا هیچ لایەنێک تا ئێستا توانیویەتی ئەم خێر و خزمەتە گەورەیە بەخەڵک بگەیەنێت؟

– کەواتە، ئێوە تەنیا خەڵک دەگوازنەوە؟

– تا ئێستا ۳۵۷۰۰ کەس زیاترمان گەیاندۆتە ئەورووپا و کیشوەرەکانی تر. ئەم کارە، وەزارەتی مرۆڤایەتیی هەر دوولا پێیان نەکراوە بیکەن. ئەوان، بەوەزارەتی هەر دوو حکوومەتەکەشەوە، مانگانە تەنیا چەند ڤیزەیەکیان هەیە.. ئەویش تەنیا بەشی خۆیان دەکات!

– ڕێگە نادەنە خەڵکی ئاسایی کە بتوانن ئەوانیش بۆ خۆیان سەفەر بکەن...

– ئێمە لە وەزارەتی مرۆڤایەتیی هەر دوو لا زیاتر خزمەتی خەڵکمان کردووە. بەبێ هیچ جیاوازییەکیش لەنێوان ڕەگەز و دین: کورد، عەرەب،







ئاشووری، تورکمان... ئێمە بەپێچەوانەی وەرازەتی مرۆڤایەتیی حکوومەتی هەرێم، هیچ جیاوازییەکیش لەنێوان خەڵکدا ناکەین. خەڵک پارەی خۆی دەدات و تەواو. لە ئیبراهیم خەلیلەوە تا ئەورووپا بەگەرەنتی دەیگەیەنین.

کابرای پاڵتۆ ڕەش زۆر بەوردی پەیڕەو و پرۆگرامی خۆیانی بۆت شیتەڵ دەکردەوە:

– دڵنیاش بە: ئێمە بەهیچ شێوەیەک تێکەڵ بەکاری سیاسەت و حزبایەتی نابین. تەنیا هێندە هەیە: پەیوەندی و هاوکاریمان لەگەڵ هەموو حزبەکان زۆر زۆر خۆشە. پەیوەندی و هاوکاریمان بەتایبەتی لەگەڵ نووسینگەکانی عەلاقاتی ئەو حزبانە لە هەموو ئەورووپا و لە هەموو وڵاتانی دەرەوەی کوردستاندا، زۆر باشە.

تۆ بەردەوام بیرت لەلای تانیا بوو، تانیای خوشکت:

– ببوورە ئەگەر قسەکەت پێ دەبڕم، تانیا بەتەنیا بووە یان لەگەڵ دوو منداڵەکەیشی؟

– لەگەڵ دوو منداڵەکەیشی... تۆ باش ئاگاداری وردەکارییەکانی ژیانیانیت. ها؟

– ئێستا لە کوێن؟

– گەڕاندراونەتەوە ئەستەمبۆڵ.

– ئێستا لە ئەستەمبۆڵن؟

کابرای پاڵتۆ ڕەش وەڵامی پرسیارەکەی تۆی، ئاوها دایەوە:

– یەکێک لە سیفەتەکانی قاچاغچیی مەرد ئەوەیە کە هەمیشە بەزەیی بەحاڵی نەفەرەکەی خۆیدا بێتەوە و لەگەڵی ڕاست و ڕاستگۆ بێت.

– مەبەستت چییە؟

– دە وەرە، مەردبە! مەرد بەو ئەم جارە (لەسەر حسابی تازەی خۆشمان) خۆت سەرپەرشتیی گەیشتنە ئەورووپای ئەم خێزانە بکە!

تۆ خەریک بوو وردە وردە لە چیرۆکەکە تێدەگەیشتیت. گوتت:

– تانیا بەخۆی و دوو منداڵەکەیەوە گەیشتۆتە سەر سنووری ئیتاڵیا..؟

بەگاڵتە بەتۆ کردنەوە، ڕاستێتیی هەواڵەکەی دووپات کردەوە:



– بەڵێ...

–قاچاغچییەکان شەش هەزار و پێنج صەد دۆلاریان لێ سەندووە و پاشان گەڕاندوویانەتەوە ئەستەمبۆڵیش؟

کابرای پاڵتۆڕەش گەڕایەوە سەر شێوازە جیددی و بەویقارەکەی خۆی، کە ڕاستییەکەیشی، سام و هێزێکی زۆری دەنواند. گوتی:

– گوێ بگرە، کاک سیروان! ئێمە زۆر شەرمەزاری ئەو خێزانە کەرکووکییەین؛ بەتایبەتیش چونکە حەمە ڕەحیم کەرکووکیی باوکی ژنەکە خزمی یەکێک لە برادەرەکانی خۆمانە. تۆ ناوی گەیلان گەرەنتی – ت بیستووە؟

– کێ !؟

– گەیلان گەرەنتی.

– نەخێر.

– خەڵکی شارەکەی خۆتانە؟

– کێیە؟

– یەکێکە لە سەرگەڤازەکانی ئێمە. ئێستا لە ئەستەمبۆڵ دەژی. ئەمڕۆ چارەگێکی ئەستەمبۆڵ هی ئەم پیاوە ملیاردێرەیە. چۆن نایناسی؟

– ئنجا بەمن چی؟ بۆ ئەم پرسیارە لە من دەکەی؟

– پیاوێکی هەتا بڵێی بەخشندە و مەرد و میهرەبانە، بەڵام دەزانی وتوویەتی چی؟ دەزانی؟ وتوویەتی: «ئەگەر ئەم پیاوەم بۆ نەدۆزنەوە، من بۆ خۆم دێم بۆ ئەورووپا و کون بەکون بەدوایدا دەگەڕێم تا دەیدۆزمەوە».

– کام پیاو؟

– چی کام پیاو؟

– کام پیاوی بۆ بدۆزنەوە؟

– تۆ.

– بۆچی؟ من چیم کردووە؟

– کارێکت کردووە بەکەس ناکرێت. ڕاستییەکەی، هەموومان زۆر پێت سەرسامین. ئافەرین!






– ئاخر، چیم کردووە؟ ئێوە بەهەڵەدا چوونە، برای من..

– چۆن چیت کردووە!

– چیم کردووە؟

– خۆت کردووە بەبرای ئەو ژنە، واتە خۆت کردووە بەمحەمەدی کوڕی حەمەڕەحیم کەرکووکی. باشیش تێیدا سەرکەوتوویت. ئافەرین.

دەتویست هەوڵ بدەیت وردە وردە بتوانیت بۆی بسەلمێنیت:

– کاکی برا، گوێ بگرە!.. من خۆم محەمەدم. من خۆم محەمەدی کوڕی حەمەڕەحیم کەرکووکیم. تانیاش خوشکمە.. خوشکی خۆمە.

– بەس..س.. س..! بەس!

هەڕەشەی لە ناکاوی ئەو پیاوە، بەتایبەتیش چونکە مەسەلەی خواردنی پارە و دزینی پارەی ئەوانی پێوە لکا بوو، تۆی خستە ناو ترس و سامێکەوە.

پایپێک بەدەستی ڕاستییەوە، قاچ لەسەر قاچ، بەویقارەوە، بێدەنگ، بەسەری نووکی پەنجەی، تنۆکێک نانی لەسەر قەراغی مێزەکە دەتەکاند. گرژ گرژ بیری دەکردەوە و خۆی ئامادە دەکرد شتێکی تازەت پێ بلێ.

کابرای پاڵتۆ ڕەش باش دەیزانی: ئاسان نییە وات لێ بکا تۆ دان بەوەدا بنێیت کە تۆ محەمەد نیت، تۆش باش دەتزانی: ئاسان نییە بۆی بسەلمێنیت کە تۆ محەمەدیت! کەواتە وا باشتر بوو جارێ بتوانیت وردە وردە بچیتە ناو نهێنییەکانی بەسەرهاتی خوشکەکەت! بزانیت ئاخۆ ڕاستە ئەم کارەساتەی بەسەرهاتووە یان ئەم تاقمە قاچاغچییە دەیانەوێ تەنیا لەپێناو پابەندکردنی تۆ بەتاقمەکەی خۆیانەوە چیرۆکێکت بۆ دروست بکەن؟ لێت پرسی:

– باشە، ئەو شەش هەزار و پێنج سەد دۆلارەیان لە ئەستەمبوڵ لێ وەرگرتووە، یان لە ئیتاڵیا؟

– ئەمەیان تۆ باشتر دەیزانیت.

پاشان لە ناکاو، بیرت کەوتەوە:

– ئەدی مێردەکەی؟ مێردەکەی لەگەڵی نەبووە؟



– مێردەکەی، لە مالمۆ دەژی. لە سوێد.

ئنجا لە ناکاو لێتی پرسی:

– باشە، ناوی مێردەکەی چییە؟

بیرت بۆ ئەو ڕۆژە گەڕایەوە کە کوڕە گەنجە تازە گەیشتووەکەت لە شەقامی تووبینگن شتراسە لەلای بورجەکە بینی و لە بەردەم چێشتخانەیەکی شاورمەی یۆنانیدا سەندەویچی گەصی دەخوارد و گوتی «من ئامۆزای خاڵی زاواکەتم». ئەرێ گوتی ناوی زاواکەت چییە؟ بیرت لە ناوی زاواکەتان دەکردەوە.

کابرای پاڵتۆ ڕەش گوتی:

– فەرەیدوون.

– ڕاست دەکەی.

– مامۆستا فەرەیدوون. مامۆستای چ دەرسێک بوو؟

– نازانم.

– مامۆستای کیمیا.

کابرای پاڵتۆ ڕەش دەستی چەپی لەسەر قەراغی چەپی مێزەکە دانابوو:

– ئەو مامۆستا فەرەیدوونە ساڵ و نیوێک پێشتر کوردستانی بەجێ هێشتووە. تۆ ئەمە دەزانی؟

– نەخێر.

– ئەو مامۆستا فەرەیدوونە، بەستەزمانە، دوای ئەوەی لە سوێد مافی پەناهەندەیی بۆ دەردەچێت و لە مالمۆ مالنشین دەبێ، لە ماوەی چەند مانگێکدا داخوا بەچ شێوەیەک پێنج هەزار دۆلار پاشەکەوت دەکات و دەینێرێتەوە بۆ هەولێر، بۆ تانیای ژنەکەی، بۆ ئەوەی پەساپۆرتێکی ئەڵمانیی پێ بکرن و پێی بگەنە لای ئەو. تۆ ئەمە دەزانی؟

– نەخێر؟

– تانیا و دوو منداڵەکەی، لەسەر بەڵێنی کاک «گەیلان گەرەنتی» کە خزمی باوکی تانیایە، بەرێگای ئیبراهیم خەلیلەوە دەگەنە ئەستەمبوڵ. تۆ ئەمە دەزانی؟







– نەخێر.

– تانیا و دوو منداڵەکەی، نزیکەی مانگ و نیوێک لە ئەستەمبوڵ دەمێننەوە.

– بەڵێ.

– دوای ئەوە، هەر برادەرانی خۆمان، بەوپەڕی سەلامەتی و دڵنیاییەوە، سەرکەوتووانە، سواری فڕۆکەی بەرەو ئیتاڵیایان دەکەن و.. دەردەچن! ئیتر ئەوەتا.. تۆ.. لێرەوە دەردەکەویت.

– من ئاگاداری هیچ شتێک لەمانە نیم.

– بێگومان.

– بێگومان.

– بێگومان. لێرەوە ناوی تۆ دێتە ناو ناوانەوە. وانییە؟

– وایە.

– تۆ بەهەموو ئەو شتانەت دەزانی کە بۆم گێڕایتەوە؟

– نەخێر.

کابرای پاڵتۆ ڕەش کەمێک داما، ئنجا بەچاوێکی پڕ لە سووکایەتی پێ کردنەوە سەیرێکی کردیت و گوتی:

– تۆ لەوەش ناچێ باش بزانیت درۆ بکەی؟

– من پێویستیم بەدرۆکردن نییە.

– ئەدی ئەگەر منێکی قاچاغچی لە تۆ باشتر هەواڵ و دەنگوباسی خوشکت و دوو خوشکەزا و زاواکەت بزانم؛ چۆن دەڵێی «تانیا خوشکی منە»؟

– تانیا خوشکی منە.

– ئاخر، تۆ ناوی زاواکەی خۆشت نازانی! ماقووڵە؟ ماقووڵە پیاو ناوی زاوای خۆی بیر بچێتەوە؟

– برای بەڕێز؛ من حەڤدە ساڵ زیاترە دایک و باوک و خوشک و براکانم بەجێ هێشتووە و لە ئەورووپام.

– ئێمە ئەوە دەزانین.



– نەک ماڵی خۆمان و خوشکەکەم، تەنانەت ئێستا من هیچی کوردستانیشم بیر نایەتەوە. بەتەواوەتی لە دەنگوباسیان دابڕاوم. ئاگام لێیان نییە.

کابرای پاڵتۆ ڕەش گوێی لێت ڕاگرتبوو.

– من لە ئیتاڵیا دەژیام، پاشان چوومە فەرەنسا، ئینجا لە کۆتاییدا هاتمە ئێرە و لێرە ناوی خۆمم گۆڕی. تەواو. ئیتر بەدرێژایی ئەو هەموو ساڵە، بەهیچ شێوەیەک ئاگاداری باوکم و خوشکەکەم نیم.

– بەدرێژایی ئەو هەموو ساڵە....؟

– بەڵێ.

– نوستبوویت، ها؟

– تەنیا ئاگام لە حاڵی خۆم هەبوو.

– تۆ لەوساوەی کوردستانت بەجێ هێشتووە، هیچ نەگەڕاویتەتەوە، وانییە؟

– ناشگەڕێمەوە.

– بۆچی؟

– لەناو ئەم تەق و تۆق و هەرای براکوژی و بەدبەختییە چ بکەم؟

– ئەدی ئەو هەموو خەڵکە لەوێ چ دەکەن؟

– من خەڵکی کەرکووکم.

– ئێ..؟!

– کە بگەڕێمەوە کوردستان و نەتوانم شارەکەی خۆم ببینمەوە، نەتوانم گەڕەکەکەم ببینمەوە، نەتوانم برا و خوشکەکانم ببینمەوە... لەو کوردستانە ئازادە چ بکەم؟ بۆ کوێ بگەڕێمەوە؟

کابرای پاڵتۆ ڕەش هەستی پێ کرد: لە کاتی ئەم قسانەی دواییتدا، هەستی غەریبی و بێکەسی و لێقەوماوی، قوڵپی گریانێکی توندی خستە هەناوتەوە. گوتت:

– ئەمە کەی وڵاتە کە تۆ نەتوانی شاری خۆت و دایکی خۆت و خوشکی خۆت و برای خۆتی تێدا ببینیتەوە؟!





کابرای پاڵتۆ ڕەش، دیاربوو وای دەزانی من نیشتیمانپەروەرێتیی پێ دەفرۆشم، دەیویست گاڵتە بەم هەست و نەستانەم بکات. گوتی:

– بەینی خۆشمان بێ: تۆ خۆشت.. بۆت دەری ناهێنێ. ئەو پارەیەی کە مانگانە لە هوتێلەکە وەری دەگری، هەر بەشی ژیانی ئێرەت دەکا و تەواو.

– وایە.

کابرای پاڵتۆ ڕەش، لەناکاو، دەستی لەسەر مەچەکت دانا و دڵی حەسرەت و ڕاستگۆییتی دایەوە:

– وا نامێنێ..!

کابرای پاڵتۆ ڕەش چاوەڕێی ئەوەی دەکرد کە تۆ یەکسەر لە پرمەی گریان بدەی. وای دەزانی «خاڵێکی لاوازی» تۆی بەدەستەوەیە. گوتی:

– بەتایبەتیش ئەگەر لە کەلی شەیتان بێیتە خوارەوە و دانی پێدا بنێیت!

– دان بەچی دابنێم؟

– بڵێی: «بەڵێ، من سیروان حیکمەت بابانم و بەناوی محەمەد حەمە ڕەحیم شوانییەوە شەش هەزار و پێنج صەد دۆلاری ئێوەم خواردووە.»!

– من؟ شەش هەزار و پێنج صەد دۆلاری ئێوەم خواردووە!؟

– بەڵێ؛ تۆ، شەش هەزار و پێنج صەد دۆلاری ئێمەت، بەناوی محەمەد حەمە ڕەحیم شوانییەوە وەرگرتووە. خۆت کردۆتە برای تانیا..

– گوتووتە «من برای تانیام».

– چۆن؟

– من برای تانیام، بەڵام...

– گوێ بگرە! تانیای خوشکی محەمەد لەسەر بەڵێنی خۆی دەبووایە ئەو بڕە پارەیە لە ئیتاڵیا بگەیەنێتە محەمەدی برای و ئەویش بیداتە ئێمە: دەسهەقی کار و ماندووبوونی خۆمان!

– من ئاگام لەم حەکایەتە نییە.

– با. تۆ، خۆت کردووە بەمحەمەد و کەسێکت ناردۆتە لای ئەو ژنە بەستەزمانە و پارەکەیت لێ وەرگرتووە. تۆ شەش هەزار و پێنج صەد



دۆلاری ئێمەت خواردووە! تەواو.

لەبەر خۆتەوە، ڕووت کردە کابرای پاڵتۆ ڕەش:

– من شەش هەزار و پێنج صەد دۆلاری خوشکی خۆم دەخۆم؟

– تۆ باش دڵنیایت، من پێم گوتیت: «ئێمە داوای ئەم پارەیەت لێ ناکەینەوە». بیبڕەوە!

تۆ لەو دەمەدا، لە ناکاو، هەستایتە سەر پێ:

– من داوای تەنیا یەک شت لە ئێوە دەکەم.!

کابرای پاڵتۆ ڕەش، بێ ئەوەی خۆی شێلوو بکات و تەماشات بکا، بەدەست پێی گوتیت:

– دانیشەوە! دانیشەوە!

– تۆ تەنیا ژمارەی تەلەفۆن یان ناونیشانی تانیای خوشکم و زاواکەم بدەرێ!

– دانیشەوە، عەیبە؛ با ئەڵمانی تێمان نەگەن! دانیشەوە، ئنجا قسە بکە!

دانیشتیتەوە:

– تۆ تەنیا ژمارەی تەلەفۆن یان ناونیشانی تانیای خوشکم و زاواکەم بدەرێ؛ ئنجا تۆ هەموو شتێکت بۆ ڕوون دەبێتەوە!

کابرای پاڵتۆ ڕەش، دەستی بۆ کلاوەکەی درێژ کرد:

– یەعنی تۆ، هەمیشە ڕژدیت لەسەر ئەوەی کە تۆ بەڕاستی محەمەد حەمە ڕەحیم شوانییت؟

– بەڵێ. من محەمەد حەمەڕەحیم شوانیم. برای تانیا.

– خەڵکی کەرکووک؟

– بەڵێ.

– لە دایکبووی...؟

– ١٩٦١/٨/٢٠

– لەکوێ؟

– لە شۆڕیجە.

– سێ چوار ساڵێک لە زانکۆی...
– فلۆرەنسا...
– لە بەشی ؟
– ئەندازیاریی میعماری..
– پاشان ؟
– پێم تەواو نەکرا.
– دایکت ناوی چییە؟
– گوڵناز حسێن.
– براکانت؟
– پۆلا و نەبەز، هەردووکیان لە شەڕی براکوژی شەهید بوونە.
– باوکت ئیشی چییە؟
– کاتی خۆی لە کەرکووک دوکانێکی پێڵاوفرۆشیی هەبوو. ئێستاش لە هەولێر، هەر هەمان کاری هەیە.
کابرای پاڵتۆڕەش، شەپقە ڕەشەکەی هەڵگرت.. هەر بەدەستییەوە، گوتی:
– مەعلووماتێکی تەواوت «لە بارەی خۆت» پەیدا کردووە.
کابرای پاڵتۆ ڕەش بەرپێتم و ئاخێزێکی تەشەراوییەوە دانی بەسەر وشەی «لەبارەی خۆت» نا. ئنجا گوتی:
– ئەمە سیفەتی هەموو قاچاغچییەکی زیرەک و سەرکەوتووە. ڕاستییەکەی، من خۆم و برادەرەکانیشم زۆر پێت موعجیب بووین، بۆیەش هاتینە لات.
– کەواتە، بەبرادەرەکانت بڵێ، تکایە: ئەو سیروان حیکمەت بابانە، هەمان محەممەد حەمە ڕەحیم شوانییە.
– چیی دیکەشیان پێ بڵێم؟
– پێیان بڵێ: ئەو قۆڵبڕەی شەش هەزار و پێنج صەد دۆلارەکەی ئێوەی خواردووە، کەسێکی دیکەیە و من نیم. لەوانەیە هەر لەناو خۆتان و سەر بەخۆشتان بێت!







– چۆن؟
– زانیوبەتی کە من ئیتاڵیام بەجێ هێشتووە و خوشکەکەم لەسەر سەفەر بووە بەرەو لای من، هاتووە ئەم هەڵەی قۆزتۆتەوە و خۆی کردووە بەمن. لەوانەیە، وەکو گوتم: هەر کەسێکی ناو جەماعەتەکەی خۆشتان بێ.
کابرای پاڵتۆ ڕەش بۆ یەکەم جار بەم قسەیەی تۆ کردت، کەوتە بیرکردنەوە:
– چۆن؟!
– باش.
هەر بەدەم بیرکردنەوەوە، چاوی داگرتبوو، شەپقەکەی لەناو دەستی، دەهێنا و دەبرد؛ وەک بڵێی دوودڵ بێت ئایا شەپقەکەی لەسەر بنێت یا نا؟ شیرازەی بیرکردنەوەی کابرات تێک دا:
– تکات لێ دەکەم: ژمارەی تەلەفۆن یان ناونیشانی تانیای خوشکم و زاواکەم بدەنێ!
– ناتوانین ناونیشان و تەلەفۆنی «تانیای خوشکت» بدەینێ.
– باشە تەلەفۆن و ناونیشانی زاواکەم..!
– بنووسە!
قەڵەمێکت بەپەلە دەرهێنا و لەسەر پسوولەی حسابی کافتیریاکە نووسیت:

Fereydun M. M.
Vasavagen 17 - B
Malmo

کابرای پاڵتۆ ڕەش، لەودەمەدا هەشت مارکی لەسەر مێزەکە بەجێ هێشت. پێش ئەوەی شەپقە ڕەشەکەی بکاتەوە سەر، لێت پرسی:
– زەحمەت نەبێ ناوی باوک و باپیری زاواکەم!
پێکەنی:
– فەرەیدوون موشیر مستەفا.
ئنجا گوتی:
– مستەفایەکە بەMU نووسراوە، واتە بنووسە: M.U. S. T. E. F. A.

کلاوەکەی لەسەر نایەوە. تەماشای ناو چاوتی کرد:

– باوەڕم پێت هات...

دڵخۆش، داوات لێی کرد:

– تکایە ژمارەی تەلەفۆنەکەیشیم بدەرێ!

کابرای پاڵتۆ ڕەش پەلەی بوو؛ بەڵام دەستی بەناو گیرفانی پاڵتۆکەی شۆڕکردەوە و سەیرێکی گازاندەبارانەیشی کردیت بۆ ئەوەی ژمارەی تەلەفۆنەکەیشیت بداتێ...

## ١٣

لە ناو شەمەندەفەری ستۆکهۆڵم بەرەو مالمۆ، لە پەنجەرەوە تەماشای دەرەوەم دەکرد: ئەو سروشتە سەوز و پاراوە، بەدارستانە چڕ و دۆڵ و کێوە سەختەکانیەوە، تیژ، تێدەپەڕین. بەفر ماوەیەک بوو توابۆوە. گوڵ و گولیلک تازە چرۆیان دەرکردبوو. سەرەتای بەهارێکی خۆش بوو. منیش لە تەنیشت پەنجەرەکەوە، تەماشای ئەو بەهارە جوانەم دەکرد و دڵم تنۆک تنۆک فرمێسکی گەرمی دادەباراند: بۆ تانیای ژنم، بۆ سەمای کچم، بۆ سەمیانی کوڕە بچکۆڵەکەم.

– تەنانەت یەک ڕۆژیش بەبێ من نەدەحەوانەوە!

–ئەدی کەوایە بۆچی بەتەنیات بەجێ هێشتن؟

– من گوتم «بە سێ مانگ پەساپۆرتەکە وەردەگرم و یەکسەر دەچمەوە لایان و دەیانهێنم».

– ئێمە لێرە کە داوامان کرد، دوو ساڵ و نیو هەر لەناو کەمپەکاندا سووڕاینەوە.

– خۆ منیش تەقریبەن هەر وام لێ هات. سێ مانگ.. بووە شەش مانگ، بووە نۆ مانگ، بووە ساڵێک.. مافی پەناهەندەییم هەر دەرنەچوو.

– من وام دەزانی هەر حاڵەتی فەلەستینییەکان وا دوا دەکەوێت!

– نەخێر. من مانگێکیش لەناو جەزیرەیەکدا مامەوە.







– هەر چۆنێک بێ، بەلای کەمییەوە شەش مانگێکی هەر پێ دەچێ..

– سەرەنجام، وردە وردە بەژیانی ناو کەمپ و ژیانی بێکەسی و پەناهەندەیی ڕاهاتم.

ڕۆژێک (تانیا) لە تەلەفۆن پێی گوتم:

– خانووەکەمان.. باش بوو خستبووتە سەر ناوی من.. دەیفرۆشم و تەواو.

– چۆن؟

– چاک.

– ئاخر..

– ئێمەش دێین بۆ لات، فەرەیدوون، توخوا.. لەوە زیاتر توانای چاوەڕێکردنمان نەماوە.

هاوارم کرد:

– کچێ نەکەن. نەیەن! تا خۆم دێمەوە!

تانیا پاڕایەوە:

– نەخێر، توخوا فەرەیدوون، بەبێ تۆ ژیانمان لێ حەرام بووە! لەگەڵ منداڵەکان خەریکە سوێمان دەبێتەوە بۆ تۆ. توخوا، مەڵێ «نەء».

– ئێ باشە، چۆن دێن؟

تانیا گوتی:

– باوکم قاچاغچییەکی خزمی خۆی دۆزیوەتەوە و دەڵێ «بە شەش هەزار و پێنج صەد دۆلار دەیانگەیەنمە ناو ئەو شارەی کە تۆ لێیت لە سوێد»؛ «بەڵام دەڵێ: دەبێ پەساپۆرتێکی ئەورووپیی قاچاغیش بۆ خۆتان بکرن».

– ئەو بەچەند؟

– دەڵێ «پەساپۆرتێکی ئەڵمانیی قاچاغ بەسێ هەزار و پێنج صەد دۆلارە. من بۆتان پەیدا دەکەم».

لە تانیام پرسی:

– ئنجا خانووەکە بفرۆشێن ئەوەندەی لێ دەردەچێ؟

– ئاخر ئەمەیە گرفتی ئێمە.

ناچار بەتانیام گوت:

– دە بەتەواوەتی ئوتومبیلەکەشم بفرۆشن و چیی کەرەستەی قەبەی ناو ماڵەکەش هەیە بەهەمان شێوە!

ئوتومبیلەکە، باش بوو، نەمخستبووە سەر ناوی خۆم. هەر بەناوی سەعیدی برام مابۆوە. گوتم:

– وەرن. وەرن قەیناکە.

تانیا شاگەشکە ببوو، لەنێوان قسەکانیدا گوتی:

– فەرەیدوون گیان، باوکم دەڵێ: «لە سوێد ئەگەر بزانن کە تۆ ژن و منداڵیشت لەگەڵتن، زووتر ئیقامەت دەدەنێ. ڕاستە؟».

– وەرن! ئاوها بکەن کە ئێستا باسمان کرد! تەواو!

– باش.

– بەڵام کێ دەتانهێنێ؟ لە تورکیا لە کوێ دەبن؟

– هەر قاچاغچییەکەی خزمی باوکم سەرپەرشتیی ئەم کارانەمان دەکا.

گوتم: کێتان لەگەڵ دەبێ؟ ئاخر، ناکرێ تۆ بەتەنیا لە تورکیا...!

– فەرەیدوون گیان، غەمی ئەوەت نەبێ، لەگەڵ ماڵە کوردێکی ئاوارەی سلێمانی بەیەکەوە بەڕێ دەکەوین. ئەها ئەوەی مێردەکەی هەر پێی دەگوتی «تۆ لە مەحموود یاسین دەچیت» و دوو جارانیش هاتنە میوانداریمان؟! ژن و مێردێکی باشن، سێ منداڵیان هەیە. دامانناوە، لەگەڵ قاچاغچییەکەی خزمی باوکم، هەموومان پێکەوە بەڕێ بکەوین..

– لە ئەستەمبۆڵیش هەر پێکەوە دەبن؟

– لە ئەستەمبۆڵیش هەر پێکەوە خانوویەک دەگرین.. هەر پێکەوە دەبین تا دەردەچین. خانووەکەی ئەستەمبۆڵیش هەر قاچاغچییەکە خۆی لە ئەستەمبۆڵ بۆمان دابین دەکات. کرێی خانووەکەش هەر عایدی قاچاغچییەکە دەبێ..

– ئێ بەڵکو لە مانگێک زیاترتان پێ چوو؟

– پارەکە ئێمە نایدەین. دەشڵێ: ناهێڵم لە مانگێک زیاترتان پێ بچێ.







تانیا و دوو منداڵەکەم کاتێ هەولێریان بەرەو ئەستەمبۆڵ بەجێ هێشت، من جارێ هێشتا مافی پەناهەندەییم بۆ دەرنەچووبوو. بەبیرمە کاتێ دواین جار تەلەفۆنم بۆ تانیا کرد لە هەولێر، گوتم:

– ئینشاڵڵا لەگەڵ پێی ئێوە، هەموومان پێکەوە ئیقامەمان بۆ دەردەچێت.

باش بوو، هەر کە تانیا و منداڵەکان گەیشتنە ئەستەمبۆڵ، من ئیقامەکەم وەرگرت و پەساپۆرتیان دامێ. هەموو یەکشەممەیەک کاتژمێر دە و نیوی شەو بەکاتی سوێد لە ماڵە عەرەبێکی فەلەستینی لە شاری مالمۆ، لە گەڕەکەکەی خۆمان، چاوەڕوانی تەلەفۆنی تانیا دەبووم بۆ ئەوەی هەواڵی تازەی خۆیانم پێ بڵێت و گوێم لە دەنگی (سەما) و (سەمیان)یش بێت؛ تا ئەوکاتەی تەلەفۆنێکم بۆ ماڵەکەی خۆم پەیدا کرد تەنیا بۆ خاتری ئەوان. ئیتر وای لێ هات، شەوێک نا شەوێک تانیا تەلەفۆنی بۆ دەکردم و تێر پێکەوە قسەمان دەکرد. لە ناکاو، چی بوو؟ نازانم: تانیا تەلەفۆنی نەما. دواین جار، هەر بەتەلەفۆن، ئەوەندەی پێ گوتم کە چاوەڕوانی ڤیزەی سوێدی یان پۆڵۆنی دەکەن. تەواو. ئیتر، دوای ئەوە، تەلەفۆنی نەما. بزر بوون. لە تەنگەتاویی خۆمدا، باش بوو تەلەفۆنێکم بۆ ماڵە خەزوورەکەم کرد لە هەولێر، پرسیم: «تانیا..؟».

خەزوورم گوتی:

– قاچاغچییەکەی خزمی خۆمان دەڵێ کە گەیشتوونەتە لای مەحەمەدی برای، لە ئیتاڵیا.

ئێستا و ئێستاش، چەند تەلەفۆنی بۆ دەکەمەوە؛ هەر هەمان وەڵامی هەیە، دەڵێ:

– قاچاغچییەکەی خزمی خۆمان دەڵێ: «گەیشتوونەتە لای مەحەمەدی برای، لە فلۆرەنسا».. «گەیشتوونەتە لای مەحەمەدی برای، لە فلۆرەنسا».

چی بکەم! سەما گیان لە کوێ بتاندۆزمەوە؟ سەمیان گیان، بۆ کوێ بچم؟ تانیا گیان، کوێ ماوە لە دواتان نەگەڕێم؟ لە کێ بپرسم؟ چی بکەم؟ ماندوو، داهێزراو، ئاورم دایەوە دەستەڕاستم. لەناو شەمەندەفەرەکە،






لەسەر کورسییەکانی تەنشت پەنجەرەی دەستەڕاست، پیاوێک و ژنێکی سوێدی (منداڵێک بەباوەشی ژنەکەوە نوستبوو). ژنەکەش سەری لارکردبووەوە سەر شانی پیاوەکە.

«خێزانێکی بەختەوەر»! دیاربوو هاوڕێی سەفەرم بوون بەرەو مالمۆ..

«فەرەیدوون گیان، دەزانم؛ تۆ خانووەکەت لەپێناو ئێمە فرۆشت، ئوتومبیلەکەت لەپێناو ئێمە فرۆشت. سەرەڕای ئەمانەش ئێستا هەر لەبەر ئێمە کەوتوویتە ژێر قەرز و قۆڵەوە: تەنیا لەپێناو ئەوەی کە ئێمە بگەینە لای تۆ و بتوانین لە سوێد پێکەوە بین! غەمت نەبێ، بەقوربانی ئەو سمێڵەت بم! بەخوا بەس بگەمە ئەوێ، لە دەمی خۆمی دەگرمەوە و پوول بەپوول پاشەکەوت دەکەین. پێش هەموو شتێک قەرزەکانت دەدەینەوە. وەک هەموو ئەم خەڵکەش دەکەوینەوە سەر باری جارانی خۆمان و باشتریش. هیچ غەمت نەبێ! بەقوربانی ئەو چاوانەت بم!».

ئەم قسانەی تانیا کە بەتەلەفۆن لە ئەستەمبوڵەوە پێی گوتبووم، لە مێشکمدا دەزرنگایەوە و دڵی دەخستمە باوەشی سەمیانەوە.

لەناو شەمەندەفەرەکەدا، غەریب غەریب تەماشای پەنجەرەکەم دەکرد و لە دڵی خۆمدا بەخۆمم دەگوت: «قسە لاوێن و جوانەکان، لە غەریبیدا، چەند شیرینتر و چەند خۆشنەواتر دەکەونە بەر گوێ !».

ئۆف، تانیا! تانیای ژنە جوان و کەساسەکەم؛ خۆزگە دەتزانی کە لێرە ئێستا چەنێک پێویستم بەچاوەکانی تۆیە؛ خۆزگە دەستەکانت لێرە دەبوون و سەری کاس و ماندوومیان دەلاوەندەوە!

– بابە، کەی دەگەینە لای تۆ؟

– کچە شیرینەکەم، سەما.. هەر وەختێ سواری فڕۆکەکەتان بوون، یەکسەر دەتانهێنێ بۆ لای من: وەک چۆلەکەیەکی زۆر زۆر گەورە، لەسەر پشتی خۆی سوارتان دەکات و فڕ.. ڕ.. ڕ.. ڕ.. ڕاست دەتانهێنێتە لای من. باش!

– ئەدی، لەسەر پشتی، ناکەوینە خوارەوە؟

– ئۆف! سەمیان گیان، خوانەکا. نا. نا. چۆلەکە گەورەکە ئێوەی خۆش



دەوێ.

نەتتوانی دیمەنی کەوتنە خوارەوەی فڕۆکەیەک، کە تانیا و سەما و سەمیانی تێدایە، لە پێش چاوی خۆت بەرجەستە بکەیت. ڕووت لەسەر خێزانەکەوە گواستەوە لای پەنجەرەکەی خۆت؛ بەڵام دڵیشت کەوتە ختوورەیەکی تازەوە:

تۆ بلێیی لەو ڕێگاوبانە دووردرێژە، لەناو فڕۆکە، شتێکیان بەسەر نەهاتبێ! یان لەناو شەمەندەفەرێک، لەناو پاپۆڕێک دەستەویەخەی چورتمێک، کۆستێک نەهاتبێتنەوە؟ ژنێکی جوان و جاحێل.. بەخۆی و دوو منداڵی پەپوولە ئاساوە!؟ یان لە ناکاو، تانیا، بۆ ئەوەی وا بزانێت زووتر دەگاتە لای من، ڕێی گۆڕیبێت و بڕیاری دابێت کە بەناو دەریای ئیجەدا بێن بۆ لای من و ڕێگای ئیتاڵیایان گرتبێتە بەر! خوا نەکا! ئۆف! تۆ بلێیی؟ یانیش لەوانەیە قاچاغچییەکان خۆیان، بۆ زووتر و باشتر گەیشتن، ڕایان گۆڕیبێت و بەدەریای ئیجەوە ڕەوانەیان کردبن! ئەگینا ئەم ئیتاڵیا ئیتاڵیایە چییە؟ بۆچی چوونەتە ئیتاڵیا؟ خوای گەورەی من، ئۆف، نەکا لە ناو دەریای ئیجە شتێکیان بەسەر هاتبێت؟ دەریای ئیجە؟ ئاخ! تۆ بلێیی؟ سەمیان گیان، سەما گیان، تانیا گیان.. گوێی شەیتان کەڕ بێت! ئەمە چییە؟ ئەم دیمەنە ترسناک و دڵخورپێنانە چین دێنە پێش چاوم؟

من دەبووایە هەر چۆنێک بێ ژمارەی تەلەفۆنی گەیلان گەرەنتی یان قاچاغچییەکانی دیکەم لەلا بووایە! خۆ کاتی خۆی داوام کرد. تانیا گوتی «نامەدنێ»، «نایانەوێ و حەز ناکەن ژمارەی تەلەفۆنیان لەلای هیچ کەسێک هەبێت». ئێستا من چۆن بزانم ئەو منداڵانەم لە کوێن؟ من چۆن بزانم لە دەریای ئیجە نەخنکاون؟ من هەواڵیان لە کێ بپرسم؟ ئەگەر ئەو ژن و منداڵانەمیان بەدەردێک بردبێت، من شکایەت لە کێ بکەم؟ کێ بەرپرسیاری کارەساتێکی ئاوهایە؟ قانوون دەتوانێ چی لەگەڵ قاچاغچییان بکات؟ هیچ. بێگومان هیچ. پاشان قانوونی کام وڵات؟ لەکوێ؟ وەڵام ئاشکرایە: لەناو دەریای ئیجە بەلەمەکەیان وەرگەڕاوە و لاشەکانیان نابیندرێتەوە..تەواو.. وەک سەدان کەسی دیکەی پێش خۆیان بوونەتە خۆراکی ماسی.




ئۆف!

باشترین شت ئەوە بوو، کاتێ لە فلۆرەنسا بووم، دەبووایە پەیوەندییەکم بەپۆلیسی ئیتالییەوە بکردایە! یان چوومایەتە... کوێ؟ کوێ! سەفارەتخانەی قاچاغچییان لەکوێوەیە!؟

لەو دەمەدا دڵم خەریک بوو شەقی دەبرد. دەتگوت خەنجەرێک چەقیوەتە دڵم و خەریکم گیان دەدەم. بەدەم سەیرکردنە ئەو سروشتە غەمگینەی لەودیو پەنجەرەوە تیژ تێدەپەڕی، بەناو ئەو ڕێگاوبانە ترسناکانەی منیان بۆ دەگەیاندەوە سوێد، پانۆرامای سەفەری خۆمم هاتەوە بەرچاو:

پایزێکی دەرەنگ بوو کە من گەیشتمە ئەستەمبۆڵ. دوو قاچاغچیم لەگەڵ بوو، یەکیان خەڵکی زاخۆ و ئەوەی دیکە خەڵکی هەولێر. لە سەرەتادا لە هوتێل «فردۆس» دایاننام. پاشان، دوای دوو شەو، دوو قاچاغچیی دیکە، هەردووکیان دهۆکی، بەئۆتومبیلێکی مارسیدسی تازەی سپی – کە دیار بوو ئۆتومبیلی تاقمێک یان پایەدارێکی ملیۆنێرە – گواستمیانەوە بۆ ماڵێک، ماڵێکی گەورە. ڕاستییەکەی، ئەو ماڵە لە حەسارێک دەچوو، بەڵام حەسارێکی خانەدان و بەباق و بریق: شەش حەوت چاوە بوو.. ئێستاش نازانم لە کام گەڕەک و لە کام شەقام و تەنانەت لە چ شارۆچکەیەکیش بوو.

لەو ماڵە گەورەیەدا، کە دارتوویەکی پیری گەورە لە ناوەڕاستیدا پەلوپۆی خۆی شۆڕ کردبۆوە، لە یەکێک لە ژوورەکاندا دایاننام و گوتیان:

– لەم ژوورە مەیەرە دەرەوە!

– نەیەمە دەرەوە؟

– نەخێر. قسە لەگەڵ کەسیش مەکە!

جانتا گەورەکانی خۆمم دانایە ناو ژوورەکە و بەجێیان هێشتم.

ژوورەکە هەموو شتێکی لێ بوو: سەللاجەیەکی گەورەی پڕ خواردن و خواردنەوە و میوە، تەباخێکی دوو چاوە، تەلەفزیۆن، سەتەلایت، حەمام، ئاودەست، سیسەمێکی پۆڵستەر، پانکە، هیتەر، موجەفیفەی قژ وشک کردنەوە، چەند کتێب و گۆڤارێک بەزمانی کوردی و عەرەبی.. تەنانەت



سێ چوار مجەللەی خیلاعیش!

لە هەمووی زیاتر کە جێگەی سەرسامیی من بوو، ئەوە بوو کە هەستم دەکرد ئەم تاقمە قاچاغچییەی کە من دەگەیەنن، زیاتر لە حزبێک یان لە حکوومەتێک دەچوون.. وەک لەوەی دەستەیەک قاچاغچی بن: ڕێکوپێکی و دیسیپلین و نەخشەدانانێکی لە ئەندازەبەدەر لە سەوداکردنیاندا لەگەڵ «موشتەری».

کۆک، ڕێکپۆش، نهێنگر، هیچ یەکێک لەو قاچاغچییانە، وەختێ بەڵێنێکیان دەدایتێ بۆ نموونە کە بێن بتبەن، یەک دەقیقە چییە دوا نەدەکەوتن. هەر هەموویان، زۆر بەدەگمەن قسەیان لەگەڵت دەکرد. کاری خۆیان چی بووایە، بەخانەدانی و دیقەتێکی بێ هاوتا و باریکبینەوە جێبەجێیان دەکرد. من بەڕاستی، کەوتبوومە گومانی ئەوەی کە ئەم قاچاغچییانە حزبێک بن لە ئەستەمبۆڵ!

لای نیوەڕۆ، یەکێکیان هاتەوە لام. لێمی پرسی:

– هیچت پێویست نییە؟

گوتم: نەخێر.. بەڵام من تا کەی هەر لێرە دەبم؟

– جارێ پەلە مەکە!

بۆ ئێوارە پیاوێکی سوورەی خرکەڵە هاتە لام، دوو پیاوی لەپشت دەڕۆیشت. خۆی پێ ناساندم و بەحورمەتێکی پڕ لە ئەتەکێتەوە کەمێک دانوشتایەوە، گوتی: «جەنابت مامۆستا فەرەیدوونیت؟».

گوتم: بەڵێ.

گوتی: منیش.. کەریم کۆستەر.

دوای یەکترناسین و سووکە گفتوگۆیەک، لە دڵی خۆمدا گوتم: کەریم کۆستەر دیارە چاوساغی منە، ئەو قاچاغچییەیە کە من بەدەریای ئیجەوە دەپەڕێنێتەوە ئەوبەر: دەمگەیەنێتە ئەورووپا...

کەریم کۆستەر– لە یەکەمین ئێوارەوە، هەمیشە، کاتێ دەگەیشتە لام، بەجلکی ئەفەندییاتییەوە، شەپقەیەکی ڕەش، پاڵتۆیەکی ڕەش، پێڵاوێکی شین.. گوڵێکی قەرنەفڵی سووریشی لەسەر پاڵتۆ ڕەشەکەی دەدا،

تەسبیحێکی درێژیش بەدەستەوە. خەڵکی سلێمانی بوو. ئێوارەیەک لێم پرسی:

– بۆچی پێت دەڵێن «کەریم کۆستەر» ؟

گوتی: کاتی خۆی لە سلێمانی کۆستەرم هەبووە، ئیتر ئەم ناوەم لەمەوە بەدواکەوتووە.

لەگەڵ کەریم کۆستەر وا رێک کەوتبووم کە هەر وەختێک من گەیشتمە ستۆکهۆڵم، کەسێک بەناوی «یاسین یابە» «کە شەپقەیەکی رەش و پاڵتۆیەکی رەش و پێڵاوێکی شینی لەبەرە و خاڵێکی رەشی گەورەش لە سەرووی برۆی چەپیەوەیەتی» دێتە کەمپەکەم و سەرم لێ دەدا ..کاغەزێکی پێیە.

کەریم کۆستەر دەیگوت:

– ئەگەر ئەو شەپقە رەشە پێی گوتیت «بەخێربێی بۆ ئەورووپا» ، تۆ دەمودەست کاغەزەکە ئیمزا بکە و ئیتر ئەو هەشت هەزار دۆلارە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی لە بانقی ئەو برادەرەتەوە لە لەندەن دەکەوێتە سەر حسابی ئێمە.

ئیتر پێویست نەبوو کە مامۆستا شەماڵی هاورێم، کە هاورێی منداڵی و «دارالمعلمین» و نادی مهندسینی جارانم بوو، لە لەندەنەوە ئەزیەت بکێشێ و بێتە لام بۆ ستۆکهۆڵم بزانێ ئایا من گەیشتووم یان نا؟ من لە ئەستەمبۆڵەوە هەشت هەزار دۆلارەکەم خستبووە سەر بانقی مامۆستا شەماڵی هاورێم لە لەندەن و ئیتر کارم بەمەسرەفی هوتێل و رێگە و ڤیزە و بلیتی فرۆکەوە نەبوو (تەنیا خواردن و خواردنەوە و مەسرەفی رۆژانەی خۆم نەبێ) تا ئەو کاتەی دەگەیشتمە ستۆکهۆڵم.

کەریم کۆستەر، دوای سێ شەو مانەوەم لەو ژوورە (کە ئێستاش نازانم ئایا ماڵ بوو یان هوتێل) پەساپۆرتەکەی دایەوە دەستم و لێمی پرسی:

– ئەم شەو، کاتژمێر یازدەی شەو، ئامادەیت بەرێ بکەوین؟

– بۆ کوێ؟

– بۆ یۆنان.







گوتم: تۆ دەمبەی؟

پێکەنی، گوتی:

– فەرقی نییە. برادەرێکی دیکەی خۆمان.. دێ بەشوێنتا و لەگەڵ خۆی دەتبا.

گوتم: ئامادەم.

گوتی: کاتژمێر یازدەی ئەم شەو ئامادە بە! شوفێرەکەمان ناوی «تاهیر تریاکە». دێ بەشوێنتانا و دەتانبا.

کەریم کۆستەر، ئنجا، بۆ زیاتر ئەرخاین بوونم، لەناو دەرگاکە، پێش ئەوەی بەجێم بێڵێ، گوتی:

– مامۆستا فەرەیدوون، ئەم خێزانەشت لەگەڵە.. ژن و مێردێک و چوار منداڵن.

دەستی بۆ لای دارتووە پیرەکەی ناو حەوشە درێژ کرد:

– خەڵکی دهۆکن.

من تەنیا لەو دەمەدا بوو کە زانیم ماڵە کوردێک لەم خانووە -هوتێلەی من تێیدا بووم، دەژیان، چونکە پێیان گوتبووم «لەم خانووە نەچیتە دەرەوە، قسە لەگەڵ کەسیش نەکەیت». دیار بوو هەمان شتیان بەئەوانیش گوتبوو. ئیدی، وا پێ دەچوو کەس لەو ماڵە نەیدەوێرا سەری خۆی لە کونی ژوورەکەی خۆی بێنێتە دەرەوە: هیچ نەبووایە لەترسی پۆلیسی تورک.

کاتژمێر یازدەی شەو، تەنیا دوو دەقیقە لای دابوو، پیاوێکی دیکە، بەناوی تاهیر تریاک، گەیشتە لامان. ئەویش هەر شەپقەیەکی رەش و پاڵتۆیەکی رەش و پێڵاوێکی شینی پۆشیبوو: لەجیاتی قەرنەفڵەکەی سەر یەخەی کەریم کۆستەر، کۆترێکی بچکۆڵەی سپیی لە یەخەی خۆی دابوو.

جانتا و کەلوپەلەکانمان ئامادە، تاهیر تریاک بۆی خستینە ناو ئوتومبیلێکەوە و بەناو دنیای تاریک و شەقامە رووناکەکانی ئەستەمبۆڵدا، بەرێ کەوتین. تاهیر تریاک، خۆی ئوتومبیلەکەی لێ دەخوڕی، گوتی:

– دەچینە ئەنطالیا.





من و پیاوە هاوسەفەرە دهۆکییەکە، لەپێشەوە دانیشتبووین. ژنەکەی و چوار منداڵەکەشیی، لە دواوە جێگەی خۆیان کردبووەوە. ناو ئۆتومبیلەکە کەمێک سارد بوو، تاهیر تریاک، کاسێتێکی (موعەززەز ئاباجی)ی خستبووە سەر. تا گەیشتینە ئەنطالیا هەر خۆی لەگەڵی بادەدا.

لە ئەنطالیاوە تا گەیشتینە سەر ئاوەکەش هەموو شتێک ئاسایی بوو، بەڵام کاتێ گەیشتینە سەر ئاوە شەپۆلاوییە سەر بەتەمەکە، ئیتر لەرز و دوودڵی و «مەترسیی خنکان» و گومانی «وەرگەڕانی بەلەمەکەمان» دەستی پێ کرد.

کابرای دهۆکی زوو زوو لێمی دەپرسی:

– تەققەمان لێ ناکەن؟

منیش هەر دەترسام، بەڵام دەمگوت:

– نەء ، باوەڕ ناکەم. شەوە. نامانبینن.

پێش ئەوەی بەبەلەم بەرەو جەزیرەکانی یۆنان بەڕێ بکەوین، لەسەر قەراغی ڕووبارەکەی ئەنطالیا، تەنیا یەک پیاوی دیکەی لێ بوو کە بەکوردی قسەی دەکرد؛ جانتاکانی بۆ دەگواستینەوە ناو بەلەمەکە. بەردەوام جگەرەیەکی کوژاوە بەلالێوییەوە، ترسی دەرەواندینەوە:

– دەی... دەی.. زووکەن!

یەکە یەکە جانتاکانی بۆ دەگواستینەوە و دەیگوت:

– دەی.. زووکەن!

من، ڕاستییەکەی، کاتێ بەلەمەکەم دیت، ترسام. بەلەمێکی زۆر بچووک بوو، دەمگوت: چۆن جێی هەمووومان لەناو ئەو بەلەمە بچووکەدا دەبێتەوە؟ جگە لەمەش، هەرگیز لە ژیانمدا بەبەلەم نەپەڕیبوومەوە. هەر چۆنێک بێ، لەناو ئەم هەموو ترس و لەرز و سامناکییە، لەم نیوەشەوە تاریکە ئەنگوستە چاوەدا، دڵم تەنیا بەترووسکایی مانگەشەوەکە خۆش بوو. لەسەر قەراغی ڕووبارەکە، کاتێ هەموو جانتاکانمان گوازرانەوە ناو بەلەمەکە و هەموو شتێک ئامادە کرا، من یەکەمین کەس سواری بەلەمەکە بووم و دانیشتم. خێزانە دهۆکییەکەش، دوای من، یەک یەک، بەیارمەتیی کابرای جگەرە بەلێو، هاتن سەرکەوتنە ناو بەلەمەکە، خەریک بوون هەر



یەکەیان جێگەی خۆیان لەناو بەلەمەکە دەکردەوە و دادەنیشتن. من لەو دەمەدا تەماشای تاهیر تریاکم دەکرد، کە ئەو جارێ هێشتا لە قەراغەکە بوو. هەر دوو دەلینگی تا بەرچۆکی خۆی هەڵکردبوو، چاوی دەگێڕا. لەژێر تیشکی مانگەشەوەکەدا دیتم: چوو دەستی خۆی تا خوار مەچەکی بەناو ئاوەکەدا ڕۆکرد. دەستێکی لە ئاوەکە داو پاشان یەکسەر هاواری کرد:

– نەء! وەرنە خوارەوە!

– بۆ؟

تاهیر تریاک دیسان هاواری کردەوە سەرمان:

– وەرنە خوارەوە !

هەموومان، زەندەق چوو، بەپەلە لە بەلەمەکە هاتینە خوارەوە و دەوری تاهیر تریاکمان دا:

– بۆ؟

– ئەم شەو سەفەر ناکەین!

پیاوە هاوسەفەرە دهۆکییەکەم، کە منداڵە هەرە بچووکەکەی بەباوەشەوە گرتبوو، گوتی:

– بۆچی؟

تاهیر تریاک بەتووڕەیییەوە تەماشای ئاوەکەی دەکرد، گوتی:

– ئەم شەو ئاوەکەی تەواو نییە.

ژنە دهۆکییەکە، گوتی:

– ئۆۆووەف!

کابرای دهۆکی، دیاربوو غەمی منداڵەکانی بوو:

– کاکە، ئێمە ئەوە هەفتەیەکە هەر چاوەڕوانی ئەم شەو دەکەین.. قوتارمان بکە!

تاهیر تریاک، گوتی:

– برای بەڕێز، ئەمەیە ئەو ئاوەی کە هەزاران پەنابەری کوردی قووت داوە. پێرێ شەو، چل کەس بەجارێک نقووم بوونە. ئەم شەو، پێتان دەڵێم: ئاوەکەی تەواو نییە.

ژنە دهۆکییەکە گوتی:







– کاکە بمانبە و قوتارمان بکە!

تاهیر تریاک، لەبەر خاتری ژنەکە تووڕەیییەکەی خۆی خاوکردەوە:

– دادە گیان، من پێتان دەڵێم: ئەم شەو ئەگەر لەم ئاوە بدەین، قووتمان دەدا. من ئاوناسم.. دەزانم. ئەم شەو ناتوانین سەفەر بکەین.

حەمباڵی جانتاکانمان، لەناو تاریکییەکەوە گوتی:

– کاک تاهیر ئاوناسە! ئەو باشتر دەزانێت. بەگوێی بکەن!

من لەو دەمەدا تەماشای ئەو ئاوە مەنگ و سامناکە جوانەم دەکرد کە سنووری تا ئەوپەڕی دنیا درێژ ببۆوە. سڵەمامەوە. ئەوەم بەبیر کەوتەوە کە یەکێک لەو برادەرانەی سنوورداش کرابوونەوە، لە هەولێر، پێی گوتبووم: «ماسیەکانی ئەو ئاوە، نزیکەی ساڵێکە، وەکو قرشیان لێ هاتووە. هەموویان فێری خواردنی گۆشتی مرۆڤ بوونە». من گوتم: «بۆچی»؟ گوتی: «هێندەی گۆشتی مرۆڤ بخۆن».

بۆ سبەینێ، کاتژمێر سێ و نیوی بەیانی، قەراغ ئاوەکانی ئەنطالیامان، بەهەمان بەلەم بەجێ هێشت بەرەو جەزیرەی (سامۆس): من و کابرای دهۆکی و ژنەکەی و چوار منداڵەکەی.

کاتێ، بەردەوام دڵمان لەناو دەست، نزیک جەزیرەی سامۆسی یۆنانی کەوتینەوە، تاهیر تریاک کە بەردەوام جگەرەی دەکێشا، گوتی:

– ئێستا کە دەگەنە ناو جەزیرەکە، یەکسەر پۆلیسی یۆنانی دێنە پێشوازیتان. یۆنانی کوردیان زۆر خۆش دەوێ. مەترسن، تەنیا ئەوەندە بڵێن: «کوردۆس»، ئیتر ئەوان خۆیان دەزانن کە ئێوە کوردن و داوای پەناهەندەیی دەکەن.

– ئەی پاشان؟

– پاش تەحقیقاتێکی کەم دەتانبەنە کەنیسەیەک. نانتان دەدەنێ، خزمەتتان دەکەن، شوێنی نوستن و حەوانەوەتان دەدەنێ.. تا ئەوکاتەی ئیدی کە خۆتان بڕیار دەدەن بڕۆن. بەڵام تکایە هەمووتان باش گوێم لێ بگرن: دوای دوو ڕۆژ مانەوەتان لە کەنیسەکە، برادەرێکی خۆمان، ناوی «قاسم قاچاغ»ە، شازدە ساڵە لە یۆنان دەژیت، هەموو یۆنان و ئەو ڕێگەوبانەی ئێوە پێیدا دەڕۆن زۆر شارەزایە، دێتە لاتان. «شەپقەیەکی



ڕەش و پاڵتۆیەکی ڕەش و پێڵاوێکی شینی پۆشیوە و ملپێچێکی نارنجیی تۆخی لە مل بەستووە». ئەگەر هاتە لاتان و گوتی: «ئێوە ئەم شەو هیچ خەونی خۆشتان دیوە بۆم بگێڕنەوە؟» پێی بڵێن: «بەڵێ. خەونێکی شینمان دیوە». ئەم قسەیە لەبیر نەکەن.. ها..!

– خەونێکی چۆن؟

– خەونێکی شین.

– شین؟

– بەڵێ. ئیتر.. یەکسەر خۆتانی پێ بناسێنن و بەگەڵی کەون. عەلاقەی هیچ شتێکی دیکەتان نەبێت. خۆی، قۆناغ بەقۆناغ دەتانگەیەنێتە ئیتاڵیا... تەواو.

هێشتا هەر لەناو بەلەمەکەشدا بوو، گوتی:

– من خواحافیز!

کابرای هاوسەفەری دهۆکیم، خواحافیزییەکەی پێ بڕی:

– تۆ ڕاوەستە! چۆن؟

– پەساپۆرتەکانی خۆتانی بدەنێ و عەلاقەتان نەبێ!

– ڤیزەی ئیتاڵیمان بۆ لێ دەدا؟

– سواری کەشتیەکەشتان دەکات. ئیتر، تا دەگەنە ئیتاڵیا.

من پرسیم:

– ئەدی لەوێوە؟

– لە ئیتاڵیاوە؟

– بەڵێ؟!

– ئەمە عایدی قاسم قاچاغە. ئێوە کە گەیشتنە دەست قاسم قاچاغ، ئیتر ئەو بەقۆناغی خۆی، شتەکانی داهاتووتان بۆ باس دەکات کە چی بکەن و چی نا! ئێوە با جارێ بگەنە دەست قاسم قاچاغ.

لەناو بەلەمەکە، لەژێر تیشکی مانگەشەو، کە تەنیا دەنگی شڵپەی هاژۆتنی بەلەمەکە لەو ناوە دەهات؛ ژنە دهۆکییەکە، دوو منداڵە ساواکەی، لە باوەش خۆی نواندبوو؛ دەستێکیشی لەسەر سنگی منداڵە گەورەکەی بوو. کوڕە گەورەکەشی، دەستی لە ناوقەدی باوکی ئاڵاندبوو و

سەری بەسەر کۆشیدا کردبوو. منیش، بەرامبەر بەو خێزانە، لە تەنیشت تاهیر ترباک، پشتم لە قسەکانی، دەمویست ورد ورد ئەو شتانە لە مێشکی خۆمدا تۆمار بکەم کە ئەو پێی دەگوتین. تاهیر ترباک لە ناکاو لەسەرخۆ کەوتەوە قسە:

– خەڵکی پەنابەری وەک ئێوە لە ئیتالیا لەگەڵ قاچاغچییەک ڕێک دەکەوێت و بە ٥٠٠ دۆلارێک دەیگەیەنێتە ستراسبۆرگ لە فەرەنسا؛ لەوێشەوە دەیسپێرێتە سنوورەکانی ئەڵمانیا و ئیدی بۆ خۆی لە شتووتگارت لە ئەڵمانیا خۆی تەسلیمی پۆلیسی ئەڵمانی دەکات. بەڵام ئێوە، جیاوازن، ئێوە ئەمانەتی ئێمەن، دەتانەوێ بگەنە سوێد. هەر چۆنێک بێ، کاتێ قاسم قاچاغ دەبینن، ئەو، هەموو شتێکتان بۆ باس دەکات و ڕێنمایی داهاتووتان عایدی ئەوە.

کابرای هاوسەفەری دهۆکیم، پێش من، هەستی بەوە کرد کە لە قەراغ جەزیرەی سامۆس نزیک کەوتووینەتەوە. ڕووی لە تاهیر ترباک کرد:

– منداڵەکان خەبەر بکەمەوە؟

تاهیر ترباک گوتی:

– بەڵێ، زوو. ئامادە بن!

بەلەمەکە خەریک بوو لە قەراغ جەزیرەکە ڕابگرێت و بێینە خوارەوە، تاهیر ترباک گوتی:

– ئەمەشتان پێ بڵێم: ئێوە ئێستا کە دادەبەزنە ناو ئەم جەزیرەیە، بەناو دارستانێکدا دەڕۆن، تا دەگەنە ئاوایی. ئێمەش کە ئێستا دەگەڕێینەوە جێی خۆمان لە ئەنطالیا، هەر ئێستا نا دەمێکی دیکە، پۆلیسی یۆنانی لەو بەرزاییانەوە تەقەمان لێ دەکەن. ئێوە، ئەگەر گوێتان لە دەنگی ئەو تەقەیە بوو، مەترسن! ئەوان تەقە لە ئێمە دەکەن، نەک لە ئێوە. هیچ نییە، فشەیە. مەترسن... دەی.. لە ئەمانەتی خوادا بن.. دەی.. خوا حافیز..

ناخۆشترین ساتەکانی ئەم سەفەرە، بۆ من، ئەو مەودایە بوو کە تازە دەستی پێ کرد: لە قەراغ جەزیرەی سامۆسەوە تا گەیشتینە ناو کەنیسەی جەزیرەکە. تا ئەژنۆمان لەناو زەلکاوی بێشەلانێکدا بووین، بەناو قامیشەلان و مێشوولە و چاڵ و چڵکاودا هەنگاومان دەنا. «من نازانم







بۆچی تەنیا لە تیمساح دەترسام». منداڵێکی بچووکی کابرا دهۆکییەکە، نوستوو، لە باوەش مندا بوو. دەیان جار تلێشە قامیش چەقینە سەروگوێلاکم. کابرا بۆ خۆیشی، دوو بچووکەکەی دیکەی لە باوەش گرتبوو و دەستی گەورەکەی ڕادەکێشا. ژنەکەی، لە دوای منەوە، کەوتبووە نێوان هەردووکمانەوە، گوتی:

– وەیش! تەقەیە. گوێتان لێیە؟

– لە ئێمەی ناگرن.

– زووکەن!

– تاهیر ترباک دەیگوت: «ئەگەر ئێمە بگیرێین، حەوت ساڵ زندان دەکرێین».

– تۆ بڵێی ئەوانیش بەسەلامەتی بگەنەوە ئەنطالیا؟

– سەرتان نەوی کەن، با نەتانبینن!

– تەقە لە ئێمە ناکەن، لە ئەوانی دەکەن.

– تەنیا بۆ دڵدانەوەی ئێمە ئەم قسەیەی کرد.

– دەستی «مەتین» بەرنەدەی، پیاوەکە!

– ئاگاتان لە بەرپێی خۆتان بێ، ئەم ناوە چاڵی زۆر تێدایە!

– زووکەن..!

– باش نییە کە بەرەبەیانە و نەختێک بەرپێی خۆمان دەبینین!

– شەو بگەشتینایە چیمان دەکرد؟

– سەرتان نەوی کەن!

– وەرن بێرەوە..!

– کەممان ماوە.. دەی..

دوای نزیکەی چارەگە سەعاتێک گەیشتینە وشکایی و کەنیسەکەمان لێ وەدیار کەوت.

لە سێیەم ڕۆژی مانەوەماندا لەناو کەنیسەکە، کاتژمێر دەوری یازدەی پێش نیوەڕۆ، قاسم قاچاغ گوتی:

– خۆتان ئامادە بکەن؛ ئەمڕۆ کاتژمێر چواری ئێوارە کەشتیەکەتان بەرێ دەکەوێ بەرەو ئیتالیا!





هەروەها زۆر بەوردی ئەوەشی تێگەیاندین کە وەختێ دەگەینە ئیتالیا چی دەکەین و چی دەڵێین و پاشان کێ دەبینین و بۆ کوێ دەچین و بەچی دەچین و لە کۆتاییشدا چۆن دەگەینە ناو فڕۆکەخانەی ستۆکهۆڵم!

کاتێ چاوم بەتابلۆی هەڵواسراوی ئەودیو پەنجەرەکە کەوت، تەماشایەکی کاتژمێرەکەی دەستی خۆم کرد، گوتم: «باشە، وا گەیشتینە مالمۆ».

ژن و مێردە سوێدییەکەش، لەگەڵ منداڵەکەیان، خەریک بوو خۆیان کۆ دەکردەوە دابەزن. منداڵەکە دەگریا. یەکسەر گریانی سەمای کچی خۆمم بیرکەوتەوە، کاتێ لە ڕۆژی خواحافیزیمدا (سەما لە سەمیان هەراشتر بوو: دەیزانی دەڕۆم!) تنۆک تنۆک فرمێسکی دادەباراند و دەگریا، دەیگوت:

– نا توخوا بابە، مەڕۆ.. بەجێمان مەهێڵە. ئاخر چیتر ناتبینینەوە..!

بە بیرکەوتنەوەی ئەم قسانەی سەمای کچم، کزە لە جەرگم هەستا. حەزم دەکرد بگریم...

## ١٤

ئەو ئێوارەیەی کە کابرا شەپقە ڕەشەکەت بەجێ هێشت، فریای ئەوە نەکەوتی بچیتە چێشتخانەی چینییەکان (ئەو چێشتخانەی کە ڕاهاتووی هەموو ئێوارەیەک، دەوری کاتژمێر حەوت و چارەگێک، لە شەقامی Was-sertor Str. شێوی تیا بخۆیت)؛ هەولێت دا زوو بگەیتە هۆتێل و فریا بکەویت بگەیتە سەر کارەکەت.

مێشکت، هەر مەژوولی ئەو مەسەلەیە: چارەنووسی تانیای خوشکت و دوو منداڵەکەی، مێردەکەی، ئنجا ئەو شەش هەزار و پێنج سەد دۆلارەی کە بەناوی تۆ لە ئیتاڵیا وەرگیراوە.

کاتێ لەسەر کورسیی پێشوازیی هۆتێلەکە دانیشتیت، بیرت لەوە دەکردەوە کە دەمودەست بکەویتە سەر نامەنووسین و تەلەفۆن کردن، بەڵام لەبەر هاتوچۆی بەردەوامی میوانەکان: دابەزین، سەرکەوتن، کلیل جێ هێشتن، تەلەفۆن گەیاندن، نووسینی ناوی میوانە تازەکان، پارە وەرگرتنی حسابی دوێنێ... تا کاتژمێر یازدەی شەو هیچت پێ نەکرا. نەشتدەویست



بەپەلەپەل هیچ بکەیت و هیچ بڕیارێک بدەی.

کاتژمێر یازدە و چارەگی شەو بوو. سەرت بەتەواوەتی چۆڵ بوو، لە پێشوازیی هۆتێلەکەدا تەنیا مابوویتەوە. دەسکی تەلەفۆنەکەت هەڵگرت:

٠٠٤٦ ئنجا کۆدی شاری مالمۆ و تەواوی ژمارەکەت لێدا. گوێت لێ بوو، تەلەفۆنەکەی مامۆستا فەرەیدوونی زاوات لە مالمۆ، لە ماڵەکەیدا دەزرنگایەوە و کەس هەڵی نەدەگرت.

جارێکی تر، دوو جاری تر، سێ جاری تر هەمان ژمارەت لێدایەوە. زرنگ.. زرنگ. زرنگ.. زرنگ. هەرگیز، کەس وەڵامی نەدەدایەوە. دەبێ لەکوێ بێ؟ ئێ ماقوولە تانیا گەڕاندرابێتەوە ئەستەمبوڵ و ئەو قیت لە ماڵەوە دانیشتبێت؟ زۆر لەوانەشە بەدوایدا چووبێتە ئەستەمبوڵ، لای قاچاغچییەکان. کابرای پاڵتۆ ڕەش گوتی کە ناوی سەرۆکەکەیان گەیلان گەرەنتییە. ملیاردێرە. بەئەسڵ خەڵکی کەرکووکە. لە کێ بپرسم؟ بێگومان ئێستا لەوانەیە کاک فەرەیدوون ناونیشانی ئەوی لە لا هەبێ، یان سۆراغێکی کردبێ! ئێستا هەبێ و نەبێ، کاک فەرەیدوون دەبێ دەنگوباسێکی تازەی لە لا هەبێت!

نەفرەتی لێ بێ: کابرای شەپقە ڕەش، ناونیشانی تانیای خوشکتی لە ئەستەمبوڵ نەدایە: بۆئەوەی بتوانیت پەیوەندییان پێوە بکەیت. زانیت بێ هوودەیە لێی بپارێیتەوە. دڵنیاش بووی کە هەر لەم ڕۆژانەدا دەتوانیت بیدۆزیتەوە و بگەیتە ئاکامێک. ئێستا چی بکەیت؟ بەم شەوە چی بکەیت؟ چیت لەدەست دێ؟ دەستت بۆ قەڵەمێک درێژ کرد و کاغەزێکت لەبەردەم خۆت دانا. دوای کەمێک بیرکردنەوە، نووسیت:

بەڕێز و خۆشەویست، مامۆستا فەرەیدوون....

هیوام بەختەوەری و سەرفرازیتە.

ببوورە؛ زۆر بەپەلە ئەم نامەیەت بۆ دەنووسم. هەرچەند بەداخەوە، تاکو ئێستا یەکتریشمان نەدیوە و یەکتریش ناناسین، بەڵام من زۆر خۆشحاڵم بەوەی کە جەنابت بوویتەتە زاوای ئێمە و شانازیت پێوە دەکەین.

ڕاستییەکەی، من ئەمڕۆ ئێوارە زانیومە کە جەنابت گەیشتوویتەتە





سوید و لە شاری مالمۆ دەژیت. بێگومان دەبووایە من، کاتێ گەیشتیتە سوید، بهاتمایە لات و سەرم لێت بدایە، بەڵام ڕاستییەکەی – من نازانم ئاخۆ جەنابت کەی یان چ ساڵێک گەیشتوویتەتە سوید؟– من ماوەیەکی زۆر لە ئیتالیا بووم، ماوەیەکیش لە پاریس بووم و لە کۆتاییدا هاتمە ئەڵمانیا. لە ئەڵمانیاش تاکو ئێستا لە حەوت شار ژیاوم و زۆر درەنگ مافی پەناهەندەییم بۆ دەرچوو (بە هەمووی ساڵ و نیوێک نابێ مافی پەناهەندەییم لە ئەڵمانیا بۆ دەرچووە و پەساپۆرتی ئەڵمانیان داومەتێ؛ هەرچەند ئەوا یازدە ساڵێک دەبێ لە ئەڵمانیام!). لە ماوەی سەرەتا لە بەرلین بووم، پاشانیش ماوەیەک لە شتووتگارت، ماوەیەکیش لە میوونخ، ئنجا سێ ساڵیش لە کۆلن بووم.. پاشان ئەمە تەنیا ماوەیەکی کورتە دیسان لە بەرلین گیرساومەتەوە و دەستم ئیشێکی گرتووە. ئیتر بۆیە، لەبەر سەرگەردانی و بێ جێگە و ڕێگەیی خۆم، جگە لەمەش (جەنابت دەزانی) کە ماڵەوەمان لە کەرکووک نەماون و هاتوونەتە هەولێر، ئیتر بۆیە تاکو ئێستاشی لەگەڵدا بێت هەواڵ و دەنگوباسی باوکم و تانیای خوشکم و جەنابتم نەدەزانی. لەوانەشە، تا ڕادەیەک «ئیهمالیی» خۆشمی تیا بووبێ. هەرچەند خۆ دوو جارانیش بەدەستی برادەران نامەیەکم بۆ کەرکووک و نامەیەکم بۆیان بۆ هەولێر ناردووە، هیچ وەڵامیان نەداومەتەوە. لەوانەشە وەڵامیان دابێتمەوە و بەدەستم نەگەیشتبێ! ئەمە غەریبییە و خۆت دەزانی: بەشەر لێرە مەژغوولتر و ماندووترە و سەدان سەراو و دەراوی بەسەر دێت و دەیان جار ناونیشانی دەگۆڕێ. هەڵبەت بێگومان، من لە خۆشی و بەختەوەریی ئێوەش زیاتر هیچی دیکەم ناوێت و داشمناوە لەم ماوەیەدا سەرێک لە کوردستان بدەمەوە و ئینشاڵڵا باوکم ببینمەوە. پیرۆزبیشتان بێت: بیستوومە دوو منداڵیشتان هەیە.

کاک فەرەیدوون گیان..

ڕاستییەکەی، ئەمڕۆ ئێوارە پیاوێک هاتە لام. عارەب بوو. لەوە دەچوو قاچاغچیی گواستنەوەی ڕێبوارەکانی سنووری کوردستان بێت بەرەو ئەورووپا، یان ئەندامی تاقمێکی قاچاغچییەکان یان نوێنەرێکیان بێت لە ئەورووپا (لە بەرلین). هاتە لام و ئەوەی بۆم



باس کرد کە تانیای خوشکم (خۆی و دوو منداڵی) گەیشتوونەتە ئیتالیا و پاشان «نازانم بۆچی و لە چ زرووفێکدا و کەی» بەرەو ئەستەمبۆڵ سنووورداش کراونەتەوە؟!

تکایە حەزدەکەم بزانم.. ئاخۆ ئەم هەواڵە تا چ ڕادەیەک ڕاستە؟ ئەگەر ڕاستە، ئایا تۆ چ دەنگوباسێکی تازەی تانیا و منداڵەکانت دەزانیت؟ تکایە ئاگادارم بکەوە بۆ ئەوەی بتوانین هاوکاریی یەکتر بکەین بۆ دۆزینەوەیان یان هیچ نەبێ دڵنیام بکەنەوە لە هەواڵی سەلامەتیی خۆتان.

کابرای عارەبی قاچاغچی ئەوەشی گوت کە گوایە من، شەش هەزار و پێنج صەد دۆلارم (لە ڕێگەی کەسێکەوە کە گوایە من ناردوومەتە لای تانیای خوشکم لە ئیتالیا) لە تانیای خوشکم وەرگرتووە بۆ ئەوەی بیدەمە سەردەستەی قاچاغچییەکان.. پاشان من ئەم پارەیەم وەرگرتووە و نەمداوەتێ و بۆ خۆم خواردوومە.

حەزدەکەم (جەنابت و تانیای خوشکیشم) هەر بۆ ئاگاداریتان ئەوە بزانن کە من کاری وام نەکردووە و ئەمە لە من ناوەشێتەوە و لەگەڵ ڕەوشتی من ناگونجێ. هەر بۆ ئاگاداری. من دڵنیام، گیروگرفتەکە لە شوێنێکی دیکەیە و لەوانەیە تانیا خۆی، لە منیش و لە جەنابیشت باشتر بتوانێ شتەکانمان بۆ ڕوون بکاتەوە.

من لەبەرئەوەی ناونیشانی تانیای خوشکم نازانم لە ئەستەمبۆڵ، هەروەها لەبەرئەوەی تەنانەت نازانم چۆن چۆنیش پەیوەندی بەماڵی باوکم بکەم لە هەولێر؛ ئەم نامەیەم بۆ بەرێزت نووسی؛ بەڵکو لە هەواڵ و دەنگوباسی خۆتان ئاگادارم بکەیتەوە. بەپێی قسەی کابرای عارەبی قاچاغچی: تانیا و منداڵەکان ئێستا لە ئەستەمبۆڵن.

ئەگەر لەگەڵ تانیا بەیەکتریش گەیشتوون و ئێستا لەلای خۆتە، ئەوا چاو و دڵتان ڕوون و ئەمەی خوارەوە ناونیشانی منە لە بەرلین؛ ئاواتەخوازم هەر وەختێکی پێتان بکرێت سەردانم بکەن.

تکایە لەو «هەواڵ» و گوێبەندەی کابرای عارەب بۆی باس کردبووم، ئاگادارم بکەوە: ڕاستە یان نا؟! چونکە زۆر نارەحەت و نائارامی کردووم. ناشزانم لێرە، دەستەوەستان و دوور، چی بکەم و چیم پێ






دەکرێت؟ مێشکم خەریکە ڕادەوەستێت. بەزووترین کات وەڵامم بۆ بنووسەوە!
لە ماڵەوە بەداخەوە ژمارەی تەلەفۆنم نییە، بەڵام ئەمە ناونیشانەکەمە:

محەممەد حەمە ڕەحیم شوانی
برای تانیای خێزانت
Sirwan Hikmet BABAN
Kirchatal. st. 33
١٠٩٦٩ Berlin

تێبینی: لێرە، ناوی خۆم گۆڕیوە و ناوم (سیروان حیکمەت بابان)ە.
ئەمەش ژمارەی تەلەفۆنی ئەو هوتێلەی تێیدا کاردەکەم، تەنیا بەشەوان لە کاتژمێر ٨ ی ئێوارەوە:
٠٠٤٩ ٦٢١٥٢٩٢٤٧٣

کاتێ پێنووسەکەت دانا، بیرت لەوە دەکردەوە نامەیەکیش بۆ سەرکەوتی هاوڕێت لە فلۆرەنسا، نامەیەکیش بۆ عیماد لە کۆڵن، هەروەها نامەیەک بۆ بەهزاد لە میونخ بنێریت و داوایان لێ بکەیت کە بەزووترین کات هەرچی نامەیەک بۆ ناو و ناونیشانی خۆت (چ کۆن، چ تازە) گەیشتبێتە ئەوان، تکایە بۆتی بنێرن!

بەڵام ئاخر پاش ئەو هەموو ساڵە، تۆ چەندین کەمپ و چەندین ماڵە برادەر و چەندین شارت کردووە.. نامەیەک بۆ تۆ هاتبێ، چۆن دەگاتەوە دەست تۆ ؟ پاشان کێ تاقەتی ئەوەی هەیە هەر بەدوای تۆدا بگەڕێ؟ لە تانیای خوشکە کەساسەکەت زیاتر کێ حەوجە و حەزی بیستنی هەواڵی تۆی هەیە، بەدبەخت!

بڕیارت دا، سبەینێ زوو ئەو نامەیەی «کاک فەرەیدوونی زاوات.»، لەسەر ڕێگەی خۆت بە«بەریدی ئێکسپرێس» ڕەوانە بکەیت!

## ١٥

ئەورووپا، بەپێچەوانەی کوردستان، ئەوەی خۆشە: کاتێ تۆ لە هەر



شارێکی ئەورووپاوە دەڵێی: «دوو سبەینێ لە کاتژمێر بۆ نموونە سێی پاش نیوەڕۆ دەگەمەوە ماڵەوە» ئیتر قسەکەت لە ٩٩٪ بەڕاست دەگەڕێت؛ هیچ گرفت و ڕێگرێک نایەنە بەردەمت؛ بەتەواوەتی، لە هەمان کات و سات و ڕۆژی دیاریکراودا دەگەیت!

چۆن لە پاریسەوە، لەناو فڕۆکەخانەی شارڵ دوگۆڵ، کاتێ حسێبی کاتی هەڵفڕینی فڕۆکەی پاریس بەرەو ستۆکهۆڵم و لەوێشەوە حسێبی کاتی بەڕێ کەوتنی شەمەندەفەری ستۆکهۆڵم بەرەو مالمۆ و لەوێشەوە حسێبی بەڕێ کەوتنی پاصی بەردەم شەمەندەفەرخانە بەرەو گەڕەکەکەی خۆمانم کردبوو و دامنابوو کاتژمێر سێی پاش نیوەڕۆ بگەمەوە ماڵەوە؛ بەتەواوەتی کاتژمێر سێی پاش نیوەڕۆ گەیشتمەوە بەر دەرگای شوققەکەم لە مالمۆ.

هەر کە بەپەلەپەل دەرگاکەم کردەوە و جانتا گەورەکەی خۆمم ڕاکێشایە ژوورەوە، تەماشای پشت دەرگاکەم کرد، دیتم: سێ نامە لە پشت دەرگاکەم کەوتوون. دەرگاکەم داخست و بەپەلەپرووزێ کەوتمە پشکنینی ناونیشانی نامەکان، بەڵکو ئەمە خوایە نامەیەکم لە تانیاوە بۆ هاتبێ!

نامەی یەکەمیان لە عیراقەوە هاتبوو، بەڵام پوولێکی کەنەدای لێ درابوو؛ دیاربوو کە لە کەنەداوە پۆست کرابوو. نامەی دووەمیان لە برادەرێکی نەرویجمەوە، هاتبووە کەمپەکەی پێشووم و لەوێوە نێردرابوو بۆ ئەم ناونیشانە تازەیەم. نامەی سێیەمیشیان لەلایەن کەسێکی نەناسیاوەوە.. لە تورکیاوە هاتبوو.

پێش هەموو شتێک ئەو نامەیەم هەڵپچڕی کە لە عیراقەوە (لە هەولێرەوە) بۆم هاتبوو. کارتێکی پیرۆزبایی بوو کە لە ماڵە خوشکەکەمەوە ناردرابوو. لەنجەی خوشکەزاکەم بوو، پیرۆزبایی لێ کردبووم «بەبۆنەی گەیشتنی تانیا و منداڵەکان بۆ ئیتاڵیا». نووسیبووی «بیستوومانە کە تانیا و سەما و سەمیان گەیشتوونەتە لات. چاو و دڵی هەمووتان ڕوون!». هەروەها سڵاوی باوکم و دوو برا بچووکەکەمی بۆم ناردبوو، نووسیبووی «هەموویان گلەیی دەکەن و دەڵێن: بۆچی نامەمان بۆ نانێرێ».

بە پەلەپەل نامەکەی نەرویجیشم خوێندەوە: فەتحوڵڵای کوڕی کەریم

کەردزی دراوسێمان بوو، کە پێکەوە لە هەولێر لە دواناوەندیی (شاکر فەتاح) مامۆستا بووین و پاشان لە یەک هەفتەدا و پێکەوە هەولێرمان بەرەو ئەستەمبۆڵ جێ هێشتبوو. لە ئەستەمبۆڵ لەیەکتری جودا بووینەوە، چونکە ئەو لەگەڵ هەندێ قاچاغچییی دیکە بەڕێ کەوتبوو. لە نامەکەیدا نووسیبووی کە دوای ساڵێک و نیو چاوەڕوانی لە نەرویج، ناچار، چووە پیرەژنێکی نەرویجیی مارە کردووە و ئیقامەکەی پێ وەرگرتووە. ئێستا ئاسوودەیە و پەساپۆرتیشی هەیە. ئنجا داوای ئەوەی لێ کردبووم کە – حەز دەکا هەواڵی من بزانێت و ئاخۆ من گەیشتووم بەچی؟ – نامەی بۆ بنووسم!

نامەی سێیەم، کە بەئانقەست دوام خستبوو بۆ کۆتایی، لەوە دەچوو نامەیەکی قورس بێت. کاتێ کردمەوە وێنەیەکی فۆتۆگراف کەوتە بەرچاوم: تانیا و سەما و سەمیان بوون. گوتم: «وەی گیان سەما». هەر سێکیان، باش هەستم پێ کرد: سەرەڕای ئەوەی پۆشتە و پەرداغ، جلوبەرگی تازەی تورکیایان لەبەرخۆ کردبوو، بەڵام لاواز ببوون. زەردەخەنە گەشەکانیانم نا بەسنگی خۆمەوە: قوربانتان بم! لە پشتەوەی وێنەکە هیچ نەنووسرابوو. ئنجا نامەکەم کردەوە، یەکسەر هەستم کرد: نامەکە بەخەتی تانیا نەنووسرابوو. حەزم دەکرد بزانم کێ ئەم نامەیەی بۆم نووسیوە؟ لە خوارەوەی نامەکەدا، لە کۆتاییییەکەیدا، کەسێک بەناوی «گەیلان گەرەنتی» ئیمزای کردبوو. گەیلان گەرەنتی کێیە؟! نووسیبووی:

ماماۆستای خۆشەویست، برای بەڕێزم، مامۆستا فەرەیدوون موشیر مستەفا..

ئەم کاتەتان شاد...

من ناوم گەیلان ڕەسوولە، خەڵکی کەرکووکم، لێرە لە ئەستەمبۆڵ پێم دەڵێن (گەیلان گەرەنتی)، ناسیاوی خەزووری جەنابتم. خەزوورت، خاڵە حەمە ڕەحیم، باوکم و برا گەورەکەم لە کەرکووک باش دەناسێت و متمانەی تەواوی بەمن هەیە. هەر بۆیەش داوای لە من کرد کە کچەکەی خۆی (بە ناوی تانیا) کە دەکاتە خێزانی جەنابت، لەگەڵ هەر دوو منداڵەکانتان لە هەولێرەوە بگەیەنمە سوێد بۆ لای خۆت.







منیش دەمودەست، دوای ڕێککەوتن لەگەڵ ئەوان، بەنرخێکی زۆر کەم (کە خوا دەزانێ تەنیا تەکلیفی پەساپۆرت و بلیت و مەسرووفاتەکانی ترە) پەساپۆرتێکی ئەڵمانیم بۆیان ناردە هەولێر و هێنامنە ئەستەمبۆڵ. پاشان خۆت (با تانیا خان بۆت بگێڕێتەوە) بزانە چ قەدر و حورمەتێکم لێیان گرتووە و چەند خزمەتیان کراوە! نەمهێشت ماوەیەکی زۆر (وەکو خەڵکی تر) لێرە بمێننەوە، هەر زوو موعامەلاتەکانم بۆیان جێبەجێ کرد.

حەزدەکەی بپرسە لای خۆت: لە ئەستەمبۆڵ هەموو کەسێک «گەیلان گەرەنتی» بەدەسپاکی و ڕاستگۆیی دەناسێتەوە. الحمد لله هەر لە منداڵییەوە خانەدان و چاوتێر و بەخشندە پەروەردە کراوم و هەرگیز چاوم لە پارە نەبووە. پارەم تەنیا بۆ ئەوە ویستووە کە خزمەتی خۆم و میللەتەکەی خۆمی پێ بکەم. خوا دەزانێ، دەیان جار ماڵ و خێزانە کوردی وا هەبوونە گەیشتوونەتە ئێرە و پارەیان پێ نەبووە، بێ ئەوەی بهێڵم لێم بپارێنەوە، لەسەر حیساب و مەسرەفی خۆم موعامەلاتم بۆیان کردووە و بلیتم بۆیان کڕیوە و بەڕێم کردوون. وە هەرگیز ئەگەر کارێک لە سەدا سەد نەزانم سەردەکەوێت، نایکەم. هەمیشە – عادەتم وایە – ئەگەر نەزانم ئەو کەسە لە سەدا سەد دەگاتە جێی خۆی، نایینێرم. بۆ ناردنی هەر کەسێک و هەر خێزانێک گەرەنتیم هەیە. من بەگەرەنتی نەبێ هیچ کەسێک نانێرم. تا ئێستا زیاتر لە هەزار خێزانم ناردۆتە ئەورووپا. هەمیشەش، کاتێ ئەو خێزانە یان ئەو کەسە دەگاتە ئەورووپا و جێیی خۆی، ئنجا پارەکەی لێ وەردەگرین.

ئەم قسانەم بۆیە بۆ جەنابت نووسی تەنیا بۆ ئەوەی دڵنیا ببیتەوە کە خێزانەکەت، تانیا خان، خوشکی خۆمە و لێرە ئەمانەتی برای خۆیەتی و غەمت نەبێ! ئەم دواکەوتنەش، باوەڕت هەبێ: خەتای ئێمەی تێدا نییە. خواش دەزانێ، هەرگیز نامەم بۆ خەڵک (بۆ خزمی ئەو کەسانەی دێنە لام و دەیانەوێ بچنە ئەورووپا) نەنووسیوە. ئەمە یەکەم جارە (لەبەر خاتری جەنابت و لەبەر خاتری خاڵە حەمە ڕەحیم) ئەم نامەیەم بۆ جەنابت نووسی و دڵنیات دەکەمەوە لە سەلامەتیی تانیا خان و دوو منداڵەکەتان.






ڕاستییەکەت دەوێ: تانیا خان زۆر پەلەیەتی! دەڵێ: «قەی ناکا بەڕێگەی ئیتاڵیاشدا بێت هەر بمانێرە، براکەم لەوێیە و بەڵکو ئەویش دەبینم و یارمەتیمان دەدا». منیش، ڕاستییەکەی، حەز دەکەم جارێ نەختێکی دیکە چاوەڕێ بکەن بۆ ئەوەی بەڕێگای فڕۆکەخانەی ئەستەمبۆڵ – ستۆکهۆڵم یان (ئەستەمبۆڵ – وارشۆ – پاشان بەپاپۆڕ – سوێد) بەشێوەیەکی باشتر و ڕاستەوخۆ بیاننێرم. بەڵام تانیا خان، لەوە دەچێ زۆر متمانەی پێم نەبێت، یانیش پەلەی بێت و نەتوانێ چیتر چاوەڕێ بکات. هەر داوای ئەوەم لێ دەکات کە بام بەڕێگای ئیتاڵیاشەوە بێت.. هەر بیاننێرم.

لێت ناشارمەوە: بەڕێگای ئیتاڵیاوە، ئیشەکە زۆر زووتر دەکرێ. تەنانەت دەتوانم – بۆ ئیتاڵیا – هەر ئێستا دەمودەست بەڕێیان بکەم. بەڵام من دەمەوێ بە«گەرەنتی» بیاننێرم و شەرمەزاری جەنابت و خاڵە حەمەڕەحیم نەبم. جگە لەمەش نامەوێ سومعەی کارەکەی خۆم بدۆڕێنم.

کەواتە، ئینشاڵڵا لەم هەفتەیەی داهاتوودا کارەکەیان بەلایەکدا دەخەم و دەیاننێرمە لای جەنابت. هیوادارم بەیەکتر شاد ببنەوە و بەزووترین کات بەیەکتر بگەنەوە. پێشتریش تانیا خان – خۆی تەلەفۆنتان بۆ دەکات.

به خواتان دەسپێرم و هەر بژین

برات : گەیلان گەرەنتی – ئەستەمبۆڵ
Geylan GERENTI
Tarlabasi Cadasi   N. 93 / 1
Beyoglu . ISTANBUL

زۆر سەیرە! ئەم کوردە تا ئێستاش فێری ئەوە نەبووە کە بەرواری نووسینی نامەکەی، لە سەرەوەی یان لە خوارەوەی نامەکەی خۆیدا بنووسێت! ئێ بۆئەوەی خەڵک بزانێ ئەم شتانەی تۆ نووسیوتن، کەی ڕوویان داوە، «جەناب»! باشە، من ئێستا، چۆن بزانم ئەم نامەیە کەی نووسراوە و هی کام ڕۆژە! چۆن بزانم ئەمەی تۆ دەیگێڕیتەوە، کەی بووە و کەی بەتەما بوویت بیاننێریت؟!

تەماشای مۆری بەریدەکەی ئەستەمبۆڵم کرد کە لەسەر پشتی زەرفی



نامەکە نووسرابوو؛ سارد بوومەوە. ئەم نامەیەی «گەیلان گەرەنتی» هەژدە ڕۆژ پێشتر نێردراوە، واتە پێش ئەو ڕۆژەی کە تانیا بەتەلەفۆن قسەم لەگەڵم بکات. ئۆف.. کەواتە، هیچ هەواڵێکی تازەی تانیا و منداڵەکانم نییە. دوای نووسینی ئەم نامەیە، بەچەند ڕۆژێک، تانیا و منداڵەکان بەڕێ کەوتوون. بەرەو کوێ؟ کەس نازانێ! چی بکەم خوایە؟!

لەسەر سیسەمەکە، هەر بەجلی سەفەرەوە، سەرم نوشتاندبووەوە ناو کۆشم، هەر دوو دەستم لەملا و لەولای لاجانگی خۆم گیر کردبوو؛ پیشم دەخواردەوە. چی بکەم! چارە چییە؟

تەنیا بەرلین ماوە! تاقە هیوایەکم بەوەیە بچمە بەرلین، لای کاک محەمەدی برای تانیا! بەڵام بچمە کام گەڕەک، کام شەقام؟ لەو بەرلینە پانوپۆڕ و فراوانەدا لە کوێ بەدوایدا بگەڕێم؟ نەخێر، لەوانەیە، لە هەمووی باشتر ئەوە بێت: لە کونی ژوورەوە دانیشم و چاوەڕێ بکەم. هیچ دوور نییە ئەمڕۆ یان سبەی، وەڵامێک، هەواڵێک، دەنگوباسێکم هەر پێ بگات. بێگومان، ئەمڕۆ یان سبەی پەیوەندییەکم هەر دەبێ پێوە بکرێت! کێ ناڵێ هەر لەم ڕۆژانەی ڕابردوودا تانیای بەستەزمان دەیان تەلەفۆنی بۆ کردووم و کەس نەبووە وەڵامی بداتەوە! بەڵێ، وا باشترە ئەم تەلەفۆنە بەجێ نەهێڵم و لەم ماڵە دەرنەچم.

## ١٦

چەند ڕۆژێکە، گیروگرفتی تانیای خوشکت و مێردەکەی و دوو منداڵەکەیان، بەتەواوەتی ڕیتمی ژیانتی گۆڕیوە! باش تێبینیت کردووە.
بەڵێ، بێگومان. ڕاستە.

جاران، خەریک بوو وردە وردە دەکەوتیتە خەوێکی قووڵەوە: تەنیا بۆ کاتی کارکردنی هوتێلەکەت وەخەبەر دەهاتیتەوە. بەڵام ئێستا هەست دەکەیت پێویستیت بەبێدارییەکی زیاتر (بێدارییەکی بەردەوام) هەیە بۆ ئەوەی بتوانیت بزانیت تانیای خوشکت و مێردەکەی و منداڵەکانیان چییان بەسەر هاتووە؟ چارەنووسیان بەچی گەیشتووە؟ دەگەنە کوێ؟





کەواتە، ئەمەیە: ئەگەر شتێک یان کەسێک لە ژیانتدا هەبێ کە خۆشت بوێت و پێوەندیت پێیەوە هەبێ، ئەوا ئەو شتە یان ئەو کەسە ڕزگارت دەکا، ژیانت پێ دەبەخشێ؛ هەمیشە بێدار و زیندووت ڕادەگرێ!

بەتانییەکەت لەسەر خۆت لادا و لەناوجێ هاتیتە دەرەوە. جزوەی قاوەکەت لەسەر تەباخەکەی تەنیشت سیسەمەکەت دەست دایە، قاوەیەکت بۆ خۆت تێ کرد.

لەسەر کورسیەکەت، ئانشکی ڕاستت لەسەر مێز، جگەرەیەکت بەدیار قاوەکەوە داگیرساند. بێدەنگ، مات، لەسەرخۆ مژت لە جگەرەکەت دەدا و جار جار (دەرەنگ دەرەنگ) فرێکت لە قاوەکەش دەدا. بیرت دەکردەوە. وەڵامدانەوەی مامۆستا فەرەیدوونی زاوات بۆچی دواکەوت؟

دەنگی تکانی دڵۆپ دڵۆپ ئاوی بەلووعەکە جارِسی کردیت. هەڵسایت چووی شێرەی بەلووعەکە توندتر بەستیت. گەڕایتەوە سەر هەمان کورسیەکەت، دانیشتیتەوە. ئینجا لە ناکاو، دەنگی ئحمەئحمی پیاوە پیرە ئەڵمانییەکەی دراوسێت ڕایچڵەکاندیت:

– ئحم. ئححححمم..

پاشان ترێک...

ئحمە ئحمەکە، لەگەڵ دەنگی ترەکەی دەنگی دایەوە. ئنجا خشەخشی سۆلەکەیشی، هێواش هێواش، لەگەڵ پێی خۆی ڕایدەکێشا. لەناکاو:

– تەپ..

بەریدی نوێی پاش نیوەڕۆ!

چووی تەماشات کرد: کۆمەڵێک گۆڤاری پرۆپاگاندە و هیچی تر.

باشتر وایە ئەمرۆش، هەر کە گەیشتیتە ئوتێلەکە، تەلەفۆنێکی تر بۆ کاک فەرەیدوونی زاوات بکەیتەوە. هەفتەیەک زیاترە کە تۆ نامەت بۆی ناردووە، کەچی.. سەیرە.. هیچ خەبەرێکی نییە!

## ١٧

– تەق.. تەق.. تەق.. تەق...

لە دەرگا درا.



گوێم لێ بوو. دیسان، زۆر توندتر، لەسەر یەکتر.. تەق تەق تەق.. لە دەرگای شوققەکەم درایەوە.

بێ ئەوەی هێشتا بچم دەرگاکە بکەمەوە، دیتم: پیرەژنە سوێدییەکەی خاوەن شوققەکەم (ئەو ڕیزە شوققەیەی کە من لە یەکێکیانیدا بووم و هەمووی هی ئەو بوون) هات وەک عیزرائیلێکی بچکۆڵە لەسەر سیسەمەکەم ڕاوەستا.

پیرەژن، بەتوورەیی و گازاندەوە، هەردوو دەستی لەملا و لەولای ناوقەدی خۆی گرتبوو. چاوە شینەکانی، وەک چاوی پشیلەیەکی زۆر گەورە، لێم زەق کردبوونەوە. منیش، وەک مردوویەک لەناو تابووتەکەی خۆم، لەسەر سیسەمەکەی خۆمەوە، ڕاکشاو لەسەر پشت، تەماشایم دەکرد، بێ ئەوەی بتوانم هیچ قسەیەک بکەم.

پیرەژنە سوێدییە خاوەن شوققەکەم، قیژاندی بەسەرما:

– تۆ بۆچی هەڵناستی؟

من، وەک مردوویەک لەناو تابووتەکەی خۆمدا، لەناو سیسەمەکەم، لەسەر پشت ڕاکشاو، هەردوو دەستم لە پشت سەری خۆم گرتبوو.

پیرەژنەکە دیسان قیژاندی بەسەرما:

– تۆ بۆچی هەڵناستیتەوە؟ ئێوەی پەناهەندە تاکو کەی لەم وڵاتەی ئێمەدا هەر دەنوون و پاڵ دەکەون؟

پاشان توندتر قیژاندی:

– تۆ بۆچی هەڵناستیتەوە، ئەی هاوار!؟

من تەماشای پیرەژنەکەم دەکرد. بەماندووییەکی یەکجار زۆرەوە گوتم:

– خانمە بەڕێزەکەم! تازە لەسەفەر گەڕاومەتەوە.. زۆر ماندووم. وازم لێ بێنە!

پیرەژنەکە، سەرەڕای تووڕەبوونی خۆی، هەستم کرد بەزەیی پێمدا دێتەوە: ڕوندک زایە ناو چاوەکانی و قوڵپی گریانێکی لە ناکاوی دا:

– تۆ بۆچی، هەمیشە هەر دەنووی؟

من وەک مردوویەک لەناو تابووتەکەی خۆمدا، لەناو سیسەمەکەم،




لەسەر پشتم ڕاکشابووم، بێ ئەوەی هیچ وەڵامی پیرەژنە سویدییەکە بدەمەوە، تەماشایم دەکرد. ئەم جا.. پیرەژن دەستی کردە گریان، گوتی:

– تانیای ژنەکەت و هەردوو منداڵەکەت لە بەحری ئیجە خنکاون. هەستە!

من، وەک مردوویەک لەناو تابووتەکەی خۆمدا؛ لە ناکاو – بەبیستنی ئەم هەواڵە – ڕاچڵەکام و هەستامەوە سەرپێ! شڵەژاو، دیتم «تەق تەق تەق تەق...» دەرگایە! رام کرد دەرگاکەم بەپەلە کردەوە.

پیرەژنە سویدییە خاوەن شوققەکەم بوو. هەر کە دەرگاکەم لێ خستە سەر گازەرای پشت، بەئینگلیزی پێی گوتم:

– تۆ بۆچی هەر دەنووی؟

من، خەواڵوو، ترساو، لە شڵەژانی خۆمدا فریانەکەوتم وەڵامی بدەمەوە، بەتایبەتیش کاتێ بینیم سێ پۆلیسی لەگەڵ خۆی هێناوە!

– من ئەوا سێ ڕۆژە هەر دێم لە دەرگاکەت دەدەم، تۆ هەر نوستووی!

– نەخێر نەنوستبووم.

– کەواتە خۆتم لێ دەکەی بەنووستوو.

– لە سەفەر بووم...

– نەخێر. دەزانم: خۆتم لێ دەشاریتەوە؟

پیرەژن – خۆی و دوو پۆلیس (ئەوەی دیکەیان لەلای دەرگای دەرەوە ڕاوەستا بوو) لەلایەکی ناو شوققەکە ڕاوەستابوون.

پیرەژن رووی لە پۆلیسەکان کرد و گوتی:

– ئەم پەناهەندە کوردەیە!

پۆلیسەکە، مووزەردێکی چاوشینی دەم و لێو ئەستوور، هەستم دەکرد چاوی لێم زەق دەکاتەوە (بەڵام هەر خۆی ئاوها بوو). پیرەژن، دیاربوو پێشتر بەپۆلیسەکەی گوتبوو کە جارێ سوێدی فێرنەبوومە. پۆلیسەکە بەدەست ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە ناسنامەکەی خۆمی بدەمێ، لە هەمان کاتیشدا بەئینگلیزی لێی پرسیم:

– ناوت چییە؟



– فەرەیدوون موشیر مستەفا.

ئنجا بەشێوەیەکی ئامۆژگارییانە پێی گوتم:

– ئەم ژنە، خاوەنی ئەم شوققەیەی تۆیە. تۆ لەوەتەی هاتوویتە ناو ئەم شوققەیە، ئەوە دوو مانگە، هیچ پوولێکت نەداوەتێ!

– ڕاستە.

پیرەژن، یەکسەر رووی لە من کرد، گوتی:

– خەتای خۆم بوو. گوتم: «قەی ناکە؛ مادام پەناهەندەیەکی کوردی بەلەنگازیت، پێشەکی مەمدەرێ، لە کۆتایی مانگدا بمدەرێ». بەبیرتە؟

من رووم کردە پۆلیسەکە، بەئینگلیزییە شرەکەی خۆم پێم گوت:

– جەناب، بەڵام من لە کۆتایی مانگی ڕابردوودا ڕوخسەتیم لێ وەرگرت؛ گوتم «لەبەر ئەوەی ژنەکەم و دوو منداڵەکەم لە ئەستەمبۆڵەوە لەسەر سەفەرن و دێن بۆ لام؛ پارەم پێویست دەبێ.. بەڵێن بێ: سەرە مانگی داهاتوو، هەر دوو مانگت پێکەوە دەدەمێ!».

پۆلیسەکە گوتی:

– ئێ، ئەوەتا، ئەوا ئێمە بەرەو سەرە مانگی سێیەم دەچین!

من کە هەرگیز چاوەڕێی ئەوەم نەدەکرد پیرەژن پۆلیسم بێنێتە سەر، گوتم:

– بەڵێن بێ: سەرە مانگی سێیەم، یەعنی ئیتر دە ڕۆژێکی تر.. هی هەر سێ مانگی بەیەکەوە دەدەمێ!

پۆلیسەکە گوتی:

– شتی وا نییە. لەسەر داخوازیی ئەم خانمە خۆی، کە هەقی خۆشیەتی، ئەگەر سبەی ئێوارە پارەی ئەم دوو مانگەی ڕابردووی نەدەیتێ، ئەوا یەکسەر ئەم هاوکارانەم دێن بزگوڕ و کەلوپەلەکانت فڕێ دەدەنە دەرەوە.

– ئاخر..

– لە کۆتاییشدا، واتە مانگی داهاتوو، بڕی ئەو پارەیەی کە تۆ قەرزاری ئەم ژنەیت، لە حسێبی بانقەکەت، بەدوو جاران، لە ماوەی دوو مانگدا دەدرێتەوە ئەم خانمە. تێگەیشتیت؟

دەمویست دەم هەڵبێنم، کابرای پۆلیس گوتی:

– تەواو! هیچ قسەیەکی تر ناکەیت! سبەی ئێوارە دوایین مۆڵەتە کە قەرزی ڕابردووی شوققەکەت بدەیتەوە!

ئەم قسانەی کرد و هەموویان چوونە دەرەوە.

کارەساتێک کە خەریک بوو وردە وردە لە ژیانی مندا بێتە پێشەوە، ئەوەتا: لە ماوەی یەک چرکەدا ڕووبەڕووی من بووەوە و دەستی پێ کرد.

من بێگومان دەمزانی پارەم لەلا نەماوە، حسێبی ئەوەشم کردبوو کە دەبوایە تا یەک دوو ڕۆژی دیکە چارەسەری «بێ پارەیی» خۆم بکەم تا سەرە مانگ! بەڵام من هەرگیز پێشبینی و چاوەڕێی ئەوەم نەدەکرد کە سبەینێ لە شوققەکەم دەردەکرێم و بێ ماڵ دەمێنمەوە.

لە ناوەڕاستی ژوورەکەم، پێخاوس، بەتاقە فانیلەیەکی عەللاگەوە ڕاوەستابووم. پێکەنینم بەتراژیدیای ژیانی خۆمدا دەهاتەوە. بەخۆمم گوت:

– من بەڕاستی، سبەینێ دەبێ چۆلی بکەم! بۆ کوێ بچم؟

## ۱۸

بەتانییەکەت لەسەر خۆت لادا و لە ناو جێ هاتیتە دەرەوە. جزوەی قاوەکەت خستە سەر تەباخە بچووکەکەی تەنیشت سیسەمەکەت.

دەنگی تکانی دڵۆپ دڵۆپ ئاوی بەلووعەکە، دیسان، سەرنجی ڕاکێشایتەوە. هەڵسایت، چووی شێرەی بەلووعەکەت توندتر بەست. گەڕایتەوە سەر کورسییەکەت و جگەرەیەکی دیکەت داگیرساند.

لە ناکاو، دیسان، دەنگی ئحمە ئحمی پیاوە پیرە ئەڵمانییەکەی دراوسێت:

– ئحم.. ئحمحم...

پاشان ترێک..

ئحمە ئحمی پیاوە پیرەکە لەگەڵ دەنگی تڕەکەی دەنگی دایەوە. ئنجا خشەخشی سۆلەکەی. هێواش هێواش، بەدوای خۆیدا ڕایدەکێشا. پاشان لە ناکاو:

– تەپ..



بەریدی نوێی پاش نیوەڕۆ!

بەپەلە تەماشای بەریدی پشت دەرگاکەت کرد، تەنیا نامەیەک بوو، لە ئەستەمبوڵەوە هاتبوو. توانیت بزانیت کێ ئەم نامەیەی بۆ ناردوویت: گەیلان گەرەنتی! خێرا زەرفی نامەکەت هەڵپچڕی. تەنیا دوو قسەی تێدا نووسرابوو:

بۆ بەڕێز، کاک محەممەدی حەمەڕەحیم شوانی..

ئەم کاتەتان شاد،

تکایە، ئەگەر ئەم نامەیەتان بەدەست دەگات، بەزووترین کات تەلەفۆنێک بکەن بۆ ئەم ژمارەی تەلەفۆنە لە ئەستەمبوڵ:

٠٢١٢ ٢٣٧ ١٠٦٣

کارەکە پەیوەندیی بەتانیا خانی خوشکتانەوە هەیە.

دڵسۆزتان: گەیلان گەرەنتی

Geylan GERENTI
Tarlabasi Cadasi N. 93 / 1
Beyoglu . ISTANBUL

## ۱۹

ناوماڵێکی خۆش و پاک و ڕازاوە. دیاربوو کە دەستی ژنێکی خاتوون و خانەدان بەڕێوەی دەبرد و پیاوێکی کاسبی عاقڵیش لە پشتەوەی هەموو کەلوپەلەکانی ناو ماڵەکە بوو.

ماڵی سەروەت سەعیدی بازرگان! تاقە ماڵێکی کورد بوو لە مالمۆ کە من چاوەڕێم دەکرد یارمەتیم بدەن. ژن و مێردێکی خەڵکی سلێمانی بوون. هەموو جارێ، کاتێ کاک سەروەتم دەدی، پێی دەگوتم:

– دەی، ئیشاڵڵا منداڵەکانیشت بەسەلامەتی دەگەنە لات و بەیەکتر شاد دەبنەوە!

ژنەکەی، خەریک بوو لەبەردەمم دەست بکاتە گریان، گوتی:

– کوێراییم دایە، ئەم بەیانییە ڕاپێچیان کرد..

– کاک سەروەتیان ڕاپێچ کرد؟

– بەڵێ.

گوتم: بۆچی؟

– ئەم عەسرە لەلای بووم. دەیگوت: «دەڵێن: تۆ چۆن توانیوتە بیست و پێنج ملیۆن کرۆنی سوێدی بۆ کوردستان بنێریتەوە؟».

– یەعنی.. لەسەر چی گیراوە؟

– لەسەر ئەوەی کە بیست و پێنج ملیۆن کرۆنی سوێدیی بۆ کوردستان ناردۆتەوە.

– بەڕاست؟

– پێیان گوتوە: تۆ ئەم پارەیەت لەکوێ بوو؟ بۆ چیت ناردۆتەوە؟

– خانم.. تۆ دڵنیای لەسەر ئەمە گیراوە؟

– ئەیەڕۆ.. ئەدی لەسەر چی گیراوە، مامۆستا فەرەیدوون؟

– هیچ نییە خانم، ئینشائەڵلا هەر ئەمشەو بەری دەدەن؟

– تۆ بڵێی؟

من دەمێک بوو شەربەتی پرتەقاڵەکەی بەردەمم تەواو کردبوو. ژنەکەش، چاوەڕێ، جار بەجار ناودەستی ڕاستی لەسەر پشتەدەستەکەی دیکەی خۆی دەدا و دەیگوت:

– وەیش! کابرا بۆ خۆی کاسبی دەکا! ڕەگەزپەرستن! ئەم سوێدییانە ڕەگەزپەرستن؛ چاویان بەکورد هەڵنایە.

– باوەڕناکەن کورد بتوانێ بیست و پێنج ملیۆن کرۆنی سوێدیی هەبێت.

– بەڵێ، پێیان ناخۆشە کورد پارە بنێرێتەوە وڵاتی خۆی!

من دەمزانی: کاک سەروەت ئەگەر دەمودەستیش بهاتایەتەوە، من هەر لە ڕووم نەدەهات کە لەم دۆخە غەمگین و ناخۆشەدا تەنانەت داوای بیست کرۆنیشی لێ بکەم. گوتم:

– شەوبۆ خان، ئینشائەڵلا کاک سەروەت ئەمشەو بەردەبێت و .. هیچ نییە. ڕاستییەکەی، حەزم دەکرد بچم سەرێکی لێ بدەم.

– نا، کاکە گیان، قەی ناکە. بەتۆ چی دەکرێ! پاشان قەدەغەشیان کردووە هاوڕێکانی سەری لێ بدەن. کوێراییم دایە.

– دەی.. کەواتە با بزانین تا سبەینێ چی دەبێ!






هاتمە دەرەوە.

بەو درەنگ وەختەی شەو، بۆ کوێ چوومایە؟ ڕووم کردایەتە کوێ؟ پیاوێکی وەک من، لە دوورە وڵاتیدا، لە ماڵمۆ، سەبارەت بەوەی کرێی دوو مانگی ڕابردووی خانووم نەداوە، هەموو بزگوڕ و کەلوپەلەکانم فڕێ بدەنە دەرەوە و خۆشم لە خانووەکە دەربکەن... بێ پارەوپوول.. بێ کەس و تەنیا.. بۆ کوێ چووما یە! ڕووم کردایەتە کوێ؟

بزگوڕ و کەلوپەلەکانی خۆمم، بەئیزنی پیرەژنە سوێدییە خاوەن ماڵەکە «لەژێر قاڵدرمەکانی ئاپارتمانەکە» کۆکردەوە و بەجێم هێشتن. پێم گوت:«با ئەم کەلوپەلانەم تاکو سبەینێ لێرە بن. سبەینێ دێمەوە دەیانبەم».

کاتێ، جانتا گەورەکەم بەسەر شانمەوە، گەیشتمە بەر دەرگای میترۆی ماڵمۆ، هەستم بەبرسێتییەکی زۆر دەکرد. لەتاو برسێتی خەریک بوو خەو دەیبردمەوە. دەمودەست، «نەوزاد نەجیب ڕواندزی»م بیرکەوتەوە، برادەرەکەی محەمەدی ژنبرام، کە چۆن لە پاریس لەژێر قاڵدرمەکانی ئاپارتمانەکەدا ماڵۆچکەیەکی بۆ خۆی دروست کردبوو، ئەو کوڕە گەنجە تێکسمڕاوە لێقەوماوەی کە شوفێرە عەرەبە پاریسییەکە پێی دەگوت «کلۆشاغ».

کەواتە.. ئەوەتا، بەم شێوەیە دەست پێ دەکات. لە سەرەتادا هەرچی پارەت هەیە خەرجی دەکەیت و هیچ پارەت پێ نامێنێ؛ پاشان لە خانووەکەشت دەردەکرێیت، بێ ماڵ و بێ جێگە دەمێنیتەوە و شوێنێکت نامێنێ لێی بنووی؛ ئیتر لە جێگەی خۆتەوە (لە برسان و لە هیلاکیان، دەبۆرژێیت و) سەرت بەسەر شانت شۆڕ دەبێتەوە و وردە وردە لە جێگەی خۆتەوە خەوت لێ دەکەوێ. کاتێ بەیانییەکەی چاو دەکەیتەوە، دەبینی لەسەر جادە یان لەناو میترۆیەک خەوتوویت و بوویتە «کلۆشاغ».

کەواتە ئاوهایە کە خەڵک لە ئەورووپا دەبێتە «کلۆشاغ»! لە سەرەتادا پارەت نامێنێ، ئنجا دوای ئەوە خانووت نامێنێ، پاشانیش ئیتر وردە وردە بەم جۆرە ژیانە ڕادێیت و دەبیتە یەکێک لە ئەوان!

ئۆف! تانیا گیان! خۆزگە چاوێکت لێم بووایە! خۆزگە دەتبینی: ئەو هەشت هەزار دۆلارەی من و ئەو دە هەزار دۆلارەی تۆش، کە بەهەمووی





دەکـــــاتە هەژدە هەزار دۆلاری ڕێک.. چۆن منی کـــــردۆتە لانەواز و لاکەوتەیەکی ئەوتۆ کە خەڵک بەزەییـان پێمدا بێتەوە! خۆزگە دەتبینی: ئەو هەژدە هەزار دۆلارەی هەمـــانبــوو.. منی گـەیاندۆتە چ زەڵکاوێک! هەژدە هەزار دۆلار! سـوێدییەکی دەوڵەمەندیش، مـامـۆستـایەکی زانکۆی سوێدیش.. تەمەننای ئەم پارەیە دەکات! هەر سوێدییەک، لێرە، لە وڵاتی خۆی، هەژدە هەزار دۆلاری هەبێت.. دەتوانێ خۆشتـرین ژیانی پێ بنیات بنێت و ئاسوودەترین ژیانی لەگەڵ ماڵ و منداڵی خۆی پێ بەسەر بەرێت! کەچی لەدەست ئێمەدا بووە ڕەشمارێک و لە گەردەنمان ئاڵا.

ئەوەتا، ماڵفرۆشتنمان، ئوتومبیل فرۆشتنمان، خانوو فرۆشتنمان.. ڕاکە ڕاکە و جەربەزەیی و خاریج خاریجمان بوو کە منی گەیاندە ئەم سەکۆ ساردەی بەردەم میترۆی مالمۆ!

«ئەورووپا» ، «ئەورووپا» ، ئەورووپا بوو کـە منی گـەیاندە ئەم ئێـوارە برسی و بێ کەس و بێ ماڵ و حاڵەی سوێد! ئەورووپا بوو کە منی گەیاندە ئەم ڕۆژە ڕەشە و تۆشی گەیاندە سەر سنوورەکانی مەرگ و تەنیایی و... سەرگەردان، کەس نازانێ ئاخۆ ئێستا چ گەردەلوول و گێژەنێک قووتی داوی! ئۆف تانیا گیان لەکوێی؟ لەکوێی! لەکوێی تا پێت بڵێم:

– ئەرێ چی بوو ئەو چێشتە حیزە هەر گەرم نەبۆوە!

لەکوێی تا پێت بڵێم:

– ئەوە بۆچی دیسان پانتۆڵەکەمت ئوتوو نەکردووە؟

لەکوێی تا پێت بڵێم:

– دە زووکە، دەی.. ناوجێگاکە ڕاخە و خەوم دێ!

لەکـوێی؟ لەکـوێی تا تۆش دەست بکەیتـەوە ملم و دڵم بدەیتـەوە، پێم بڵێی:

– فەرە گیان توورە مەبە! دەگەڕێینەوە.. دەگەڕێینەوە وڵاتی خۆمان.

لەکوێی تا تۆش سەمیان بخەیتە باوەشمەوە و پێم بڵێی:

– تەواو. بستێک وێرانەکەی وڵاتی خۆمان بەهەموو ئەورووپا ناگۆڕمەوە و.. تۆبە!



لەکـوێی؟ لەکوێی تا بێیت دەستم بگریت و لەم زەلکاوە ڕەشە ساردەم ڕزگار بکەیت و دووبارە سەری کاسم بنێیتەوە سەر سینەی نەرمی خۆت و لەگەڵما بگریت و بڵێیت:

– غەریبیت دەکەم...

لەکوێی تانیا گیان، لەکوێی تا پێت بڵێم:

– ئۆخەی، تانیا گیان؛ خۆ دۆزیتمەوە!

ئۆف، تانیا گیان، بەس ئەگەر ئەم جارە بتدۆزمەوە!

جـانتـا گـەورەکـەم بەتەنیـشـتـمـەوە، ئانشکم بەسـەریدا دابوو، لەژێر قـاڵدرمـەکـانی ناو مـیـتـرۆی مـالمۆ، لە نزیک کـووشکەکـە، قـاچم لێ ڕاکێشـابوو، غـەریب غـەریب، تەمـاشـای ڕێبـوارەکـانم دەکـرد و غـەمگین غەمگین بیرم لە حاڵی خۆم دەکردەوە؛ بیرم لە دوێنێ دەکردەوە، کە چۆن لە ناکاو هەموو شـتێک گۆڕا، کە چۆن لە ناکاو دەرکـرام و بێ ماڵ مـامەوە؛ بیرم لە تانیـا و سەمـا و سەمـیان دەکردەوە.. دەبێ لەکوێ بن، گـەیشـتبنە کوێ؟

دوێنێ بەیانی، پێش ئەوەی شـوقـقـەکـەم بەیەکـجاری بەجێ بێڵم، هیچ نامـەیەکم دیسـان بۆ نەهات و هیچ تەلەفـۆنێکیش نەکرا. ئەم بەیانییـەش، دیسان، سەرێکی شوققەکەم دایەوە.. هیچ!

لەژێر قـاڵدرمـەی ناو مـیـتـرۆی مـالمۆ، ئانشکم بەسـەر جـانتـاکـەمـەوە، سەرەڕای غەمگینی و غەریبی و بێ کەسی و بێ لانەیی خۆم، بەڵام هەستم دەکرد باش توانیومە خۆم وا پیشـان بدەم کە چاوەڕێی شەمەندەفەری بەرەو شوێنێک.. دەکەم! برسێتی نەبووایە، بەهەموو شتێکی دیکەم هەل دەکرد...

چەندی بیـرم دەکـردەوە، جـەسـارەتم نەدەکـرد بچم داوای قـەرزی هەزار کرۆنێک لە ماڵە فەلەستینییەکەی دراوسێمان بکەم!

باشە، من بۆچی، دوێنێ، کاتێ نامەم بۆ محەمەدی برای تانیا نووسی، نەمگوت «هەندێ پارەم بۆ بنێرە!» ، بۆچی بەڕاشکاوییەوە بۆم نەنووسی کە لەبەرئەوەی کرێی خانووی دوو مانگی ڕابردووم نەدابوو، بەزەبری پۆلیس لە شوققەکە کردمیانە دەرەوە و ئێستا لەسەر جادەم و لەناو میترۆ دەنووم؟ لە







هەمووی سەیرتر، من باش دەمزانی تەنانەت یەک کرۆنیش چییە پێم نەماوە، بۆچی بۆم نووسی کە ئەمشەو تەلەفۆنت بۆ دەکەم بۆ هوتێلەکەت؟ ئەگەر پارەی کارتی تەلەفۆنێکم هەبووایە، لەوانەیە بارمی هەندێک سووکتر بکردایە: تەلەفۆنێکم دەکرد بۆ قاسم، قاسمە درێژ، لە ستۆکهۆڵم. خۆ ساڵانێکی زۆرە برادەرین، لە ڕووم دەهات پێی بڵێم: «قاسم، هەزار کرۆنێکی خۆتم، بەقەرز، بۆ بخە سەر حسابەکەم». بەڵام ئەدی دوای ئەوە؟ ئەدی ئەگەر من بمەوێ سەرێکی ئەستەمبوڵ بدەم و بچم سۆراغێکی ئەو منداڵانەم بکەم! نەخێر. کاری من بەهەزار کرۆن و بەدوو هەزار کرۆن مەیسەر نابێت! نەخێر!

باشترین چارەسەر ئەوە بوو کە دەموودەست سواری شەمەندەفەر بم بەرەو بەرلین، بۆ لای محەمەدی ژنبراکەم بەڕێ کەوم. ناونیشانەکەم لایە، زوو دەمدۆزییەوە. جانتاکەم فڕێ دەدایە ماڵەکەی و دەمگوت: «محەمەد گیان، ئەمە حاڵی منە! چی بکەین!». نەخێر، هیچ عەیب نییە، ژنبرای خۆمە و لەماڵەکەی دەمێنمەوە.

کەواتە، هەزار کرۆنێک، تا دەگەمە بەرلین، چارەسەرێکی باشە، بەشی بلیت و بەشی نانخواردنی ئەم ئێوارەیەشم دەکات. بەڵێ.

– هەزار کرۆن لە کێ بەقەرز وەربگرم؟

من سەبارەت بەوەی تەنیا دوو مانگ و نیو بوو هاتبوومە مالمۆ، تەنیا ماڵی سەروەت سەعیدی بازرگان و سێ چوار کوڕی گەنج و مێردمنداڵم لە مالمۆ دەناسین. دەمزانی کاک سەروەت ئەمڕۆش هەر بەرنەدراوە، تازە ئەگەر بەریش درابێت، لە ڕووم نایەت دیسان بچمەوە ماڵەکەیان و بەم وەزعە ناخۆشەیان داوای قەرزیان لێ بکەم.

لەناو هەموو ئەو کوڕە گەنجە کوردانەی مالمۆش، بیرم تەنیا لە یەکێکیان کردەوە، دەیگوت «خەڵکی کوورانم». پێدەچوو منی لە هەولێر، لە دوورەوە ناسیبێت و بزانێ کە مامۆستام، چونکە یەکەم جار کاتێ یەکترمان ناسی، بە«مامۆستا» ناوی بردم. کاتێ لەگەڵ گەنجەکانی دیکەی برادەریشی، لە گۆگادەکەی مالمۆ شەربەتمان دەخواردەوە، ویستی پارەی شەربەتەکەی منیش بدا. شوققەکەیشی، لە هەمان گەڕەکەکەی من بوو.



شوققەکەیم دۆزییەوە و چوومە بەردەرگاکەی. کاتێ دەرگاکەمی لێ کردەوە، دیار بوو تازە لە خەو هەستابوو. گوتم:

– ببوورە ئەگەر لە خەوم هەستاندبیت!

چاوی خۆی هەڵدەپشافت، گوتی: قەی ناکە.

گەلێک ڕووخۆشانە بەخێرهاتنی لێ کردم:

– فەرمووو! فەرموو مامۆستا!

من حەزم نەدەکرد بچمە ژوورەوە، پێشم جوان نەبوو هەموو چیرۆکی خۆمی بۆ بگێڕمەوە و بڵێم «لەسەر ئەوەی کرێی خانووم نەداوە، لە شوققەکە دەریان کردووم». هەر لەبەر دەرگاکە، بەکورتی بڕاندمەوە و لە کۆتاییدا گوتم:

– ئیدی باوکەکەم.. تۆش وەکو کوڕی خۆم وایت، تا سەری مانگ، ئەگەر لەلاتە هەزار کرۆنێکم بەقەرز بدەیتێ.. سوپاست دەکەم!

ئەو کوڕە گەنجە سوێندی بەگۆڕی باوکی خۆی خوارد کە ئەمە نزیکی سەرەمانگە و بۆ خۆیشی تەنیا ١٧٥ کرۆنی لە لا هەیە! یەکسەر باوەڕیم پێی کرد و بەجێیم هێشت بۆ ئەوەی بۆ خۆی بچێت بنوێتەوە.

– چی بکەم؟ هەزار کرۆن لە کێ قەرز بکەم؟

چارەسەری دیکەم نەبوو: تەنیا ماڵە فەلەستینییەکە نەبێ! باشترە. دەچم لە دەرگای ئەوان دەدەم. ئێستا لە ماڵەوەن. بەبیانووی ئەوە دەچم کە ئاخۆ هیچ نامەیەکم بۆ نەهاتووە بۆ ئەوێ! ئەگەر دیتیشم ڕوویان لەگەڵم کرایەوە، تەلەفۆنێکیش بۆ ماوەی یەک خولەک هەر لەلای ئەوانەوە بۆ محەمەد دەکەم و پێی دەڵێم: «ئەمشەو دەگەمە لات». ماڵێکی خانەدان و باشن. گفتیان دەدەمێ، دەڵێم:

«بەڵێن بێ! سەری مانگ دەتاندەمەوە».

ئەم ماڵە فەلەستینییە، دەمێکە دەیانناسم. هەر لەگەڵ یەکەمین ڕۆژی گەیشتنم بۆ مالمۆ بۆ ئەم گەڕەکە؛ سەرەڕای ئەوەی دوو ماڵی سوێدی لەنێوان ماڵی ئەوان و شوققەکەی مندا هەیە؛ خۆیان بەدراوسێی من زانیبوو و هەر لە یەکەم ڕۆژی گەیشتنمەوە، ئەبوو ئەیاد، ئێوارەکەی،







جەمێک کوببەی فەلەستینیی بۆ هێنام و گوتی:

– لەلای ئێمە عادەتە.

گوتم: چی؟

گوتی: ئەگەر ماڵێکی تازە بێتە گەڕەک، چێشتی بۆ دەبەین.

گوتم: سوپاس. لەلای ئێمەش هەر وایە!

ئەبوو ئەیاد! دڵنیام داخوازییەکەم ڕەت ناکاتەوە! ئەوپەڕی ئەگەر نەشیبوو، دەڵێم: «باشە پارەی کارتێکی تەلەفۆنم بدەرێ؛ بەڵکو ئەمشەو تەلەفۆنێک بۆ محەمەدی ژنبراکەم بکەم هەندێ پارەم بۆ بخاتە سەر حسابی بانقەکەم»!

## ٢٠

بەتانییەکەت لەسەر خۆت لادا و لەناوجێ هاتیتە دەرەوە. جزوەی قاوەکەت خستە سەر تەباخە بچووکەکەی تەنیشت سیسەمەکەت.

دەنگی تکانی دڵۆپ دڵۆپ ئاوی بەلووعەکە، دیسان، سەرنجی ڕاکێشایتەوە. هەڵسایت، چووی شێرەی بەلووعەکەت توندتر بەست.

گەڕایتەوە سەر کورسییەکەت و جگەرەیەکی دیکەت داگیرساند.

لە ناکاو، دیسان دەنگی ئحمە ئحمی پیاوە پیرەکەی دراوسێت:

– ئحم.. ئححمم...

پاشان ترێک..

ئحمە ئحمی پیاوە پیرەکە لەگەڵ دەنگی ترەکەی دەنگی دایەوە. ئنجا خشەخشی سۆلەکەی. هێواش هێواش، بەدوای خۆیدا ڕایدەکێشا. پاشان لە ناکاو:

– تەپ..

بەریدی نوێی پاش نیوەڕۆ!

بە پەلە تەماشای بەریدی پشت دەرگاکەت کرد، تەنیا نامەیەک بوو، لە بەرلینەوە هاتبوو، لەلایەن مامۆستا فەرەیدوونی زاواتەوە. خێرا زەرفی نامەکەت هەڵپچڕی. نووسیبووی:



بۆ بەڕێز، کاک محەمەد حەمەڕەحیم شوانی..

کاکە محەمەد گیان،

ئەم کاتە و هەموو کاتێکی دیکەت هەر شاد بێ!

ڕاستە: من زاواتانم و تۆش برای تانیای خێزانمیت؛ کەچی تا ئێستاش یەکتریمان نەدیوە! دیارە، ئەم حاڵەتە، سەبارەت بەزرووفی نائاسایی کوردستان، بەسەر زۆر کەسی دیکەشدا هاتووە. هەر چۆنێک بێ، زۆر خۆشحاڵم بەناسینی جەنابت و هیوادارم لە داهاتوویەکی نزیکدا چاومان بەیەکتر بکەوێت.

ڕاستییەکەی، من لەمێژە گەیشتوومەتە سوێد، نزیکەی ساڵ و نیوێک دەبێ؛ بەڵام پێشتر هەر لە کەمپ بووم. تەنیا دوو مانگ و شتێک (هەر چۆنێک بێ سێ مانگ دەبێ) کە مافی پەناهەندەییم بۆ دەرچووە و پەساپۆرتیان داومەتێ. ئێستا لە مالمۆ دەژیم، شارێکی بچکۆڵەیە لە باشووری سوێد.

گلەییم لێ نەکەی: من هەر لەو ڕۆژەوەی گەیشتوومەتە سوێد تاکو ئەمڕۆ زیاتر لە حەوت نامەم بۆ ناردووی، بۆ ئیتاڵیا. بەهەمان شێوە، تانیای خوشکیشت، باوکیشت (لە هەولێر و لە ئەستەمبۆڵەوە)..

دەزانم: بەردەوام نامەیان بۆت ناردووە. ڕاستییەکەی، ئێمە کەسمان، نەماندەزانی کە تۆ ئیتاڵیات بەجێ هێشتووە و ڕووت کردۆتە وڵاتێکی دیکە. ئەگەر نامە و ناونیشانی تازەی خۆت بۆ ماڵی باوکت نارد، ئەمە ناونیشانەکەیەتی:

(هەولێر. نزیک تەربیە. بەرامبەر ساحەی ڕیەکانی عەنکاوە

شوققەی ماڵە ئاوارەکانی کەرکووک

قاتی یەکەم. ماڵی حەمە ڕەحیم کەرکووکی)

ئەمەش ژمارەی تەلەفۆنەکەیەتی: ٢٨٦٣٠

ئەگەر ویستت ڕاستەوخۆ هەواڵی بزانیت.

پێشم خۆشە کە لە بەرلین دەستت ئیشێکی گرتووە و لە هوتێلێک کار دەکەی. ڕاستییەکەی، باوکت، لەوانەیە پێویستی بەیارمەتیی تۆ هەبێت. خراپ نییە ئەگەر جار جار، وەک کوڕی هەموو خەڵک، شتێکیان بۆ بنێریتەوە!

بەڵێ، دوو منداڵمان هەیە؛ گەورەکەیان (سەما) کچە، ئێستا دەبێ تەمەنی شەش ساڵ بێت؛ بچووکەکەشیان (سەمیان) کوڕە، تەمەنی ئەویش سێ ساڵە. بێگومان شاگەشکە دەبن ئەگەر خاڵی خۆیان ببیننەوە و بزانن خاڵێکیان هەیە! تانیا هەمیشە دەیگوت: «سەمیان لە محەمەدی برام دەچێ».

کاک محەمەد گیان،

زۆر زۆرم پێ خۆش بوو کە لەناکاو نامەی تۆم بەدەست گەیشت و هەواڵتم زانی. ناشزانم کێ ناونیشانی منی پێ داویت (یاخوا خێری بنووسرێ!)، چونکە من لە ئەورووپا، بەتایبەتیش لە سوێد زۆر کەم خەڵک دەناسم و برادەرم زۆر کەمن. تۆ ئەو ناونیشانەی منت لەکوێ بەدەست کەوتووە؟

تۆ وا پێ دەچێ ئاگادار نەبیت و نەزانیت: من زیاتر لە دوازدە ڕۆژە هەر بەدوای تۆدا دەگەڕێم و دەمەوێ بتدۆزمەوە. برادەرێکم هەیە ناوی ئیبراهیم شەمزینی-یە، دوور بەدوور تۆ دەناسێت، پێی گوتم کە کاتی خۆی تۆ لە فلۆرەنسا لەگەڵ کوڕێک بەناوی ڕۆژیار، بەیەکەوە شوققەیەکتان بەکرێ گرتبوو. ئەو کاک ڕۆژیارە خزمی ئیبراهیم شەمزینیی برادەری منە. ئیتر ئەو کاک ئیبراهیمە ناونیشانی ڕۆژیاری برادەرەکەی تۆی بۆ ناردم و گوتی: «بچۆرە فلۆرەنسا، بۆ لای ڕۆژیار.. دڵنیابە دەیدۆزیتەوە!». پاشان دیتم باوکیشت هەمان ناونیشانی تۆی لە فلۆرەنسا بۆ ناردم کە هەمان جێگە بوو. ئیتر، بۆیە، من هەستام، لە ماڵمۆوە بەرەو فلۆرەنسا بەڕێ کەوتم، بۆ ئەوەی تۆ بدۆزمەوە!

بەداخەوە، کاک ڕۆژیار ناونیشانی تۆی نەدەزانی، دەیگوت: چونکە زۆر لەمێژە فلۆرەنسای جێ هێشتووە.. بەڵام دوای چوار پێنج ڕۆژ مانەوەم لە فلۆرەنسا و سۆراغکردنم لە برادەرە کوردەکانت، برادەرێک لە فلۆرەنسا (خوا خێری بنووسێ!) ناونیشانی برادەرێکی تۆی دامێ (نەوزاد نەجیب ڕواندزی) لە پاریس؛ ئەویش باش بوو پێی گوتم کە تۆ ئێستا لە بەرلین دەژیت. کەواتە من، ئەگەر ئەمڕۆ ئەم نامەیەی تۆ نەگەیشتایەتە دەستم؛ دامنابوو کە سبەینێ یەکسەر بەرەو بەرلین، بۆ



لای تۆ بەڕێ بکەوم. هەرچەندە، سەبارەت بەوەی ناونیشانی تەواوی تۆم لە لا نەبوو، زۆر هیلاک و ماندوو دەبووم هەتا دەمدۆزیتەوە؛ تەنانەت کە ناوی خۆشت گۆڕیوە، ئەمە مانای وایە هەر زۆر زەحمەت دەبوو بتدۆزمەوە. کەواتە ئەم ناوگۆڕینەی تۆ بووە کە هەموو شتێکی لە ئێمە تێک داوە و هیچ نامەیەکی منیش و تانیاش نەگەیشتۆتە دەستت! جگە لەوەی کە چەند ساڵە تۆ فلۆرەنسات بەجێ هێشتووە و ئەم هەموو وڵات و ئەم هەموو شارانەی ئەڵمانیات کردووە؛ ناوی خۆشت گۆڕیوە! منیش لێرە ئیتر سوێد و ئیتاڵیا و فەرەنسا نەما، لە ماوەی ئەم هەفتەیەدا بەدواتدا نەگەڕێم. هەر چۆنێک بێ، وەک دەڵێن (لە ئاسمان بەدواتدا دەگەڕام و تۆ لەسەر زەوی بەردەستم کەوتی).

کاکە محەمەد گیان،..

ئەو هەموو گەڕان و سۆراغکردنەی من بەدوای تۆدا تەنیا بۆ ئەوەبوو کە منیش سۆراغی (تانیا) و منداڵەکانت لێ بکەم! بزانم ئاخۆ لەکوێن و چییان بەسەر هاتووە؟ چونکە من، قاچاغچییەکان (ئەوانەی تانیا و منداڵەکانیان لە ئەستەمبۆڵەوە بەڕێ کردووە) بەهیچ شێوەیەک ناناسم. تانیا دەیگوت کە یەکێک لە قاچاغچییەکان خزمی خاڵە حەمەڕەحیمە و کەرکووکییە، متمانەیان زۆر پێیەتی. دوێنێش نامەی یەکێک لەو قاچاغچییانەم لە ئەستەمبۆڵەوە پێ گەیشتووە و ناوی «گەیلان گەرەنتی»یە. پێ دەچێ هەمان ئەو قاچاغچییەی خزمی باوکت بێت. گەیلان گەرەنتی کێیە؟ تۆ دەیناسیت؟ تکایە، ئەگەر ڕاستە کە ئەم قاچاغچییە خزمی ئێوەیە و دەیناسیت، بەزووترین کات پەیوەندیی پێوە بکە و سۆراغی تانیا و منداڵەکانی لێ بکە! چونکە لە نامەکەی خۆیدا کە بۆ منی ناردووە، هیچ ژمارەی تەلەفۆنێکی خۆی بۆ من نەنووسیوە. دڵنیاشم دەبێ تەلەفۆنی هەبێت! ئەم پیاوە قاچاغچییە، واتە گەیلان گەرەنتی، تاقە کەسێکە کە ئەمڕۆ بتوانێ پێمان بڵێ: تانیا و منداڵەکان لەکوێن؟ من هەر ئەمڕۆ ئێستا -هەر ئێستا - نامەکەی تۆم بەدەست گەیشتووە و وا دەمەودەست وەڵامت بۆ دەنووسمەوە. دوای تەواوکردنی ئەم نامەیە، خۆیشم تەلەفۆنێک بۆ باوکت دەکەمەوە و داوای ژمارەی تەلەفۆنی ئەو گەیلان گەرەنتییەی لێ دەکەم، بەڵکو ئەگەر ژمارەکەی






لە لا بێت و بمداتێ.. خۆم قسەیەک لەگەڵ گەیلان گەرەنتی خۆی دەکەم و بزانم داخوا تانیا و منداڵەکان گەیشتوونەتە کوێ و چییان بەسەر هاتووە؟! تۆش لای خۆتەوە، تکایە، هەمان شت بکە و هەوڵێک بدە!

گەیلان گەرەنتی لە نامەکەیدا نەینووسیوە ئاخۆ تانیا و منداڵەکانی بەکام ڕێگەدا و بەرەو کوێ ڕەوانە کردووە؛ بەڵام باوکت، کە تەلەفۆنی بۆ دەکەم، هەمیشە پێم دەڵێ «گەیشتوونەتە ئیتاڵیا، لای محەمەد».

ئیتر منیش بۆیە تەنگاوبووم و چوومە ئیتاڵیا. تەنانەت دوای ئەوەی کە لە ئیتاڵیاش گەڕامەوە، لەناو فرۆکەخانەی پاریسەوە، دیسان تەلەفۆنێکم بۆ باوکت کردەوە، کەچی دیسان هەمان شتی پێ گوتمەوە: «گەیشتوونەتە ئیتاڵیا، لای محەمەد». باوکت، ڕاستییەکەی، تا ئێستا، لەوە زیاتر، نەیتوانیوە هیچ شتێکی دیکەم پێ بڵێت! لەوانەشە، لەوێ، قاچاغچییەکان درۆی لەگەڵ بکەن!

من پێش ئەوەی بشچمە ئیتاڵیا، گومانم لەوە هەر هەبوو کە بەڕاستی هاتبنە ئیتاڵیا بۆ لای تۆ. بەهەر حاڵ، وەزعەکە ئاوایە و تانیا خۆیشی هەفتەیەک زیاترە هیچ سەروسەدا و دەنگوباسێکی نییە. نە تەلەفۆنێکی بۆ کردووم، نە نامەیەکی ناردووە. نازانم بەخۆی و بەدوو منداڵەوە لەکوێن و چییان بەسەر هاتووە؟ ئایا ڕێگەیان لێ هەڵە بووە؟ ئایا گیراون و سنووردراش کراونەتەوە؟ ئایا قاچاغچی قۆڵی بڕیون و شتێکی لێ کردوون؟ یان بەبەحری ئیجەدا هاتوون و (خوانەکا!) لە ئیجە خنکاون؟! نازانم. بەتەواوەتی شپرزە و بەدحاڵ بوومە و نازانم چی بکەم؟ سێ ڕۆژە، لەوەتەی لە فلۆرەنسا گەڕاومەتەوە، چارەگە سەعاتێکیش چییە لە ماڵ نەچوومەتە دەرەوە: لەترسی ئەوەی نەوەک تانیا تەلەفۆنێکم بۆ بکات! کەچی هەر چاوەڕێ دەکەم و هیچ خەبەرێکیان نییە! لە کێ بپرسم؟ چی بکەم! نازانم چی بکەم. وەزعی دەروونی و ماددیشم لێرە زۆر خراپە. هەموو شتێکم لێ تێک چووە. کاتی خۆی، ئوتومبیل و خانووەکەمان و هەرچی هەمانبوو فرۆشتمان و دامانە پەساپۆرتی تەزویر و پارەی «سەفەر». لە هەولێر، وەلحاصڵ، ئێستا هیچمان نەماوە. لێرەش، خۆت دەزانی، من تەنیا دوو مانگ و شتێکە پەناهەندەییم بۆ



دەرچووە. ئەو پارەیەی کە لە ماوەی ئەم دوو مانگەدا لە سۆشیالی ئێرە وەرم گرت، تەنانەت بەشی ئەم سەفەرەشمی نەدەکرد بەرەو ئیتاڵیا و فەرەنسا و گەڕانەوەم. هەرچی پارەی هەمبوو، بەهەدەر چوو، لە پێناو هیچ.

تکایە ئاگاداریش بە: چیتر بەناونیشانی پێشووم نامەم بۆ مەنووسە، چونکە ناونیشانم گۆڕاوە و چیتر لەوێ ناژیم. بەم ناونیشانەی خوارەوە نامەم بۆ بنێرە کە ناونیشانی ماڵە عەرەبێکی فەلەستینین، دراوسێی منن، بەڵام بەعەرەبی لەسەری بنووسە (لید الاخ فریدون)، دەمناسن، خۆم هەموو ڕۆژێ جارێک بۆ وەرگرتنی نامەکانم دەچمە لایان و دەگاتە دەستم. ئەمە ناونیشانەکەیە:

Fewaz AL_ TAMIMI
Vasavagen 19 - B
Malmo

کاک محەمەد گیان،

من ناتوانم هەندێ شت هەیە ئێستا لەبارەی خۆمەوە بۆت باس بکەم، چونکە من و تۆ ئەمە یەکەم جارە – ئەویش بەنامە – یەکتر دەناسین و دەترسم بەغەڵەت لێم تێ بگەی، بەڵام تەنیا لەوەندە تێ بگە کە من ئێستا باری دەروونیم زۆر خراپە و وەزعی ماددیشم بەتەواوەتی تێک چووە. ئیرادەم بەیەکجاری ڕووخاوە و نازانم چی بکەم و بۆ کوێ بچم؟! هیچیشم پێ ناکرێ. حەز دەکەم ببمە تنۆکێک فرمێسک و عەرز قووتم بدا.

من هیوام تەنیا بەوە هەبوو کە هاتبێتنە بەرلین بۆ لای تۆ. ئەوا ئێستا تۆ دڵنیات کردمەوە کە لەلای تۆش نین. ئیتر چی بکەم؟ بۆ کوێ بچم؟ لەکوێ بگەڕێم؟ نازانم. خەریکە مێشکم تێک دەچێ. تێناگەم: چوونەتە کوێ؟ لەکوێن؟ بۆچی تەلەفۆنێکم بۆ ناکەن؟ بیر تەنیا لە یەک شت دەکەمەوە: ڤیزەیەکی تورکیا وەربگرم و بچمە ئەستەمبوڵ، بۆ خۆم لە ئەستەمبوڵ بەدوایاندا بگەڕێم. ئەویش جارێ پێم ناکرێت و تا ئێستا بڕیارم نەداوە. ڕاستییەکەی، دەبێ پارەیەک بۆ ئەو سەفەرەم بەرەو ئەستەمبوڵ بێتە دەستم ئنجا دەتوانم. جگە لەوەش خۆت دەزانی: ماوەیەکی زۆری پێ دەچی تا ڤیزەی تورکیات دەدەنێ. هەر





چۆنێک بێت، ئەمشەو تەلەفۆنێکت بۆ دەکەم و بەتەلەفۆن هەندێ قسە دەکەین.

من راستییەکەی، ئەمڕۆ بەیانی، دوای ئەوەی کە نامەکەی تۆم بەدەست گەیشت و خوێندمەوە، بۆ ئێوارەکەی یەکسەر دەبووایە ماڵەکەم چۆڵ بکەم و ئەم خانووە (ئەم ناونیشانەی ئێستام بەجێ بێڵم). ئیتر بەداخەوە، تەلەفۆنەکەشم لە قیس چوو، ئەگینا ژمارەی تەلەفۆنی خۆمتم دەدایێ و دەتتوانی تۆ تەلەفۆنم بۆ بکەیت.

هەر چۆنێک بێ، گرنگە: تۆ خۆشت پەیوەندی بەقاچاغچییەکەی ئەستەمبوڵەوە بکە، کە ناوی گەیلان گەرەنتییە. ئەمەی خوارەوە ناونیشانەکەیەتی. ژمارەی تەلەفۆنەکەی خۆی بۆم نەنووسیوە. «لەوە دەچێ ئەم قاچاغچییانە ژمارەی تەلەفۆنی خۆیان نەدەنە باوکی خۆشیان!». بەڵام خراپیش نییە، وەکو گوتم: ئەگەر تەلەفۆنێک بۆ باوکت بکەیت و ژمارەی تەلەفۆنەکەی لە ئەو وەربگریت. چونکە وەک باسی دەکەن، ئەو گەیلان گەرەنتییە خزمی خۆشتانە و دەبێ تەلەفۆنەکەی، لەلای باوکت هەبێ.

Geylan GERENTI
Tarlabasi Cadasi N. 93 / 1
Beyoglu . ISTANBUL

ئیتر تکایە تۆ خۆت تەلەفۆنێک بکە و بزانە ئەو قاچاغچییە کێیە کە خزمی ئێوەیە و جێی متمانەیە! چونکە وەکو پێم گوتی: ئەو گەیلان گەرەنتییە ئەمڕۆ تاکە کەسێکە کە بتوانێ پێمان بڵێ تانیا و منداڵەکان لەکوێن! ئەگینا کێ بەرپرسیارە لە چارەنووسی تانیا و ئەو منداڵانە؟ چییان لێ هاتووە؟ هەروەها حەز دەکەم تەلەفۆنێک بۆ هەولێریش بکەیت، بۆ باوکت، بەڵکو بزانیت هەواڵی تازەی ئەوێ چییە؟ ئیتر، محەمەد گیان، هەرچی شتێکی دیکەشت لەدەست دێت، لای خۆتەوە بیکە! چونکە من لێرە، بەڕاستی، هەموو شتێکی خۆمم لەسەر دانا و باری دەروونی و ماددیم، وەکو پێم گوتیت، زۆر خراپە. خەوم نەماوە. کە دەشنووم هەمیشە خەونی ناخۆش دەبینم...

لەبارەی ئەوەشەوە کە پیاوێک (وەک تۆ دەڵێی لەوانەیە قاچاغچی بێت) هاتۆتە لای تۆ و گوتوویەتی کە گوایە (شەش هەزار و پێنج



سەد دۆلارەکە) تۆ خواردووتە؛ دڵنیابە کاک محەمەد گیان: من بەهەموو شتێک بڕوا بکەم بەمە بڕوا ناکەم. ئەمە لە ئەخلاقی تۆ و ماڵی ئێوە ناوەشێتەوە. بەڵام تکایە، بچۆرەوە لای ئەو پیاوە عەرەبە قاچاغچییە و لێی بکۆڵەرەوە: بزانە مەسەلەکە چییە؟ چۆنە؟ لە هەمووشی گرنگتر سۆراغی ئەوەی لێ بکە کە تانیا و منداڵەکان ئێستا لەکوێن؟ ئەمە، ئێستا، لە هەموو شتێک گرنگترە. چونکە من پێم وایە، وا دەردەکەوێت، کە کەسێک (هەبێ و نەبێ قاچاغچیشە! لەوانەشە سەر بەهەمان جەماعەتی خۆیشیان بێت) قۆڵی تانیاش و قۆڵی گەیلان گەرەنتی-شی بڕیبێت! هەرچۆنێک بێ، من وا تێ دەگەم: تانیا و منداڵەکانی من بوونەتە قوربانیی سەخافاتی ئەو قاچاغچییانەی کە «گەیلان گەرەنتی» لە ئەستەمبوڵ سەرکردەیانە. بەڵام نازانم چۆن؟! وا پێ دەچێ یەکێک لە قاچاغچییەکان (هەر لە جەماعەتی خۆیان) خیانەتی کردبێت و پارەکەی خواردبێت؛ لەو نێوانەشدا تانیا و منداڵەکان تووشی چورتمێک هاتبن! نازانم.

تانیا و منداڵەکانی خوشکی خۆتت لەبیر بێت، تکایە.

چاوەڕێی وەڵامی بەپەلەتم. ئەمشەو خۆشم تەلەفۆنێکت بۆ دەکەم.

من جارێ خوا حافیز

فەرەیدوون

## ٢١

من لە رۆژی (١/٣/٢٠٠٢) گەیشتمە پاریس بەمەبەستی تازەکردنەوەی پەساپۆرتەکەم، کە هەر لە ساڵی (١٩٩٦)ەوە کۆتایی پێ هاتبوو.

لە شاری پاریسەوە، دوای تازەکردنەوەی ئیقامەکەم و وەرگرتنی پەساپۆرتی نوێی فەرەنسی، گوتم: «فرسەتە، با سەرێکیش لە هەندێ برادەرانم لە سویسرا بدەم و ئنجا بگەڕێمەوە هەولێر».

دووەمین رۆژم لە شاری ژنێف، ئێوارەیەکی بەهاریی خۆش بوو، لەناو کافیتریایەکی جوانی زێڕەوشاندا، لە تەنیشت بانقێک، پێش ئەوەی سواری شەمەندەفەر بم و بەرەو لای (جەوودەتی هاوڕێم) بەڕێ بکەوم، دیتم




لە بەرامبەرم، پیاوێکی سەر ڕووتاوە، شەپقەیەکی ڕەشی لەسەر مێزەکەی بەردەم خۆی دانابوو و بەردەوام تەماشامی دەکرد؛ لێم ورد دەبۆوە.

نیگای ئەو پیاوە نیگایەکی ئەورووپییانە نەبوو؛ تەنانەت ئادگاریشی، بەتەواوەتی لە ئادگاری پیاوێکی ڕۆژهەڵاتی دەچوو. جگە لەمەش، من – بۆ خۆیشم، لە شوێنی خۆمەوە کەوتمە بیرکردنەوە: من ئەم پیاوەم لەکوێ دیوە؟ بۆچی ئاوها سەیرم دەکا؟ کێیە؟

من بەردەوام بیرم دەکردەوە، لەناکاو بینیم کابرا لە شوێنی خۆی بەرز بۆوە، وردە وردە لە مێزەکەی من نزیک کەوتەوە و پێکەنی. بێ دڵ لە دڵ دان، بەکەیفخۆشییەوە نەختێک نوشتایەوە و پەنجەی بۆ من درێژ کرد و پێکەنی، گوتی:

– تۆ دکتۆر فەرهاد نیت؟

گوتم: با

– د. فەرهاد پیربال!؟

گوتم: بەڵێ، با. برای بچووکتم.

دەستێکی لەسەر کورسییەکەی بەرامبەرم بوو، بەدەستەکەی دیکەیشی شەپقە ڕەشەکەی خۆی گرتبوو. وەک ئەوەی گاڵتەم پێ بکا یان بیرەوەرییەکی خۆشی بیربێتەوە، گوتی:

– ئەو دکتۆر فەرهادەی داینابوو خۆی بسووتێنێ؟

منیش پێکەنیم، گوتم:

– بەڵێ..

ئنجا بۆ ئەوەی لەوە زیاتر تەریق نەبمەوە، گوتم:

– فەرموو دانیشە!

دانیشت.

من دەمێک بوو بیرم لەوە دەکردەوە: ئاخۆ ئەم پیاوەم لەکوێ دیوە؟ کێیە؟
لە ناکاو بەبیرم هاتەوە! خەریک بوو لە خۆشییان هاوار بکەم:

– ئێ..ێ..ێ..! چۆنی؟

هەستامەوە سەرپێ:



– مامۆستا فەرەیدوون!

لەنێوان کورسی و مێزەکانەوە هاتینە دەرەوە و بەشەوقێکی زۆرەوە باوەشمان بەیەکتردا کرد. ئەو گوتی:

– ئەوە لێرە چی دەکەی!

– چۆنی؟

گەڕاینەوە شوێنی خۆمان و دانیشتین، دوو قاوەمان بانگ کرد. من پێم گوت:

– دەبێ بمبووری، مامۆستا، کە نەتمناسییەوە!

– ئاخر تۆش.. زۆر گۆڕاویت.

مامۆستا فەرەیدوون، لە قۆناغی ئامادەیی، لە دواناوەندیی (شاکر فەتاح) لە هەولێر، دەرسی کیمیای پێ دەگوتین. گوتم:

– بەبیرمە، جەنابت، تەنیا سێ مانگ دەرست بەئێمە گوتەوە.

گوتی: لەوانەیە.

ئنجا گوتی:

– بەڵام من باش دەتناسم.

لەم کاتەدا تەماشای تەپڵەسەرە ڕووتاوەکەیم دەکرد، کە جاران بەپرچێکی پڕ و لوولی زەردی جوان داپۆشرابوو، گوتم:

– دەستت ماچ دەکەم. برای گەورەی، مامۆستا فەرەیدوون!

بە کەیفخۆشییەوە گوتی:

– جار جار دەتبینین لە سەتەلایتی پارتی!

– بەڵێ.

– وا بزانم بەرنامەیەکت هەیە؟

مەبەستی، بەرنامەی (ڕۆناهی) بوو. بیست و سێ زنجیرەم لەو بەرنامەیە لە کەناڵی ئاسمانیی Ktv پێشکەش کردبوو. گوتم:

– ڕاست دەکەی، بەڵام ئێستا ڕام گرتووە.

– ئەدی ئێستا چی دەکەی؟

– لە هەولێرم.







– لە تەلەفزیۆن ئیش دەکەی؟

– نەخێر، مامۆستام لە کۆلیژی پەروەردە، لە زانکۆی سەلاحەدین لە هەولێر.

بە هەمان تاسووقەوە (کە لەوانەیە ئەم تاسووقەی، زیاتر بۆ غەریبی کردنی کوردستان بووبێت) گوتی:

– هەموو جارێ کە لە تەلەفزیۆن لەسەر شاشەی سەتەلایت دەتبینم، لە دڵی خۆمەوە حەسوودیت پێ دەبەم! دەڵێم: ئەم پیاوە چۆن توانی بڕیار بدات و بەیەکجاری بگەڕێتەوە کوردستان؟

گوتم: چی بکەم! هەر یەکێک لە ئێمە زرووفێکی تایبەتی هەیە.

گوتی: لەم ماوەیە ڕۆمانێکت بلاوکردبۆوە و لە سلێمانی شکاتیان لێت کردبوو.

من زۆرم پێ خۆش بوو کە دیتم ئەم مامۆستایە لە ئەورووپا هێندە ئاگاداری ناوەوەی کوردستانە و بەدوای هەواڵە ڕۆشنبیرییەکانیشدا دەچێ.

گوتم:

– باش ئاگاداری ڕەوشی کوردستانیت!

– جاربەجار لە ئەنتەرنێت لاپەڕەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان دەکەمەوە.

پرسیم: جەنابت لێرە دەژی؟

گوتی: لێرە. لە ئەمستردام. لە ژنێف. لە برۆکسل. لە ڕۆما... لەم ناوەم ئیتر. دێم و دەچم.

حەزم دەکرد بزانم بەچی و چۆن دەژیت. لێم پرسی:

– کارت چییە؟

دەستی لەسەر شەپقە ڕەشەکەی دانا:

– کاسبی دەکەم.

– ژن و منداڵت.. لەگەڵتن؟

– تەلاقیان دام.

من باش تێنەگەیشتم مەبەستی چی بوو، گوتم:

– ببوورە؟



بەبێ باکی و بێ بایەخییەکی ئەوتۆوە کە لە هەستێکی قووڵی بێهوودەییەوە هاتبێت، گوتی:

– دەبێ بڵێم «ژنەکەم.. تەلاقی دام».

هەندێک شەرمم کرد لێی بپرسم «بۆچی»، گوتم:

– چۆن؟

بەناوەدەستی، تۆپەڵە دووکەڵەکانی جگەرەکەی منی لە خۆی دوورخستەوە:

– کاک دکتۆر، من یازدە ساڵ زیاتر لە سوێد ژیام. هەست دەکەم کەس وەک من ئەم ئەورووپایە ناناسێت.

مامۆستا فەرەیوون دیار بوو گرێ کوێرەیەکی قورس لەسەر دڵی هەبوو، دەیویست بیکاتەوە! من بێدەنگ بووم، هەستم دەکرد ئازارێکی گەورە چنگی لە ڕۆحی ئەم پیاوە ناسکە گیر کردبوو. ماوەیەک بێدەنگ، هیچ قسەی نەکرد. هەستم کرد دەیەوێ بگری. لە ناکاو گوتی:

– سۆزانین..!

من لەودیو ئادگار و دڵ لەرزین و قوڵپی گریانی مامۆستا فەرەیدوونەوە، هەستم پێ کرد: زوڵمێکی گەورە دەرهەق بەم پیاوە بێ تاوانە کراوە! هیچم نەگوت.

قسەکانی، دەتگوت خوێنێکە و لە برینێکی قووڵ دادەچۆڕێ:

– من هەرچی ماڵ و موڵک و سامان و هێزی خۆم هەبوو (لە کوردستان و لە سوێدیش) لەسەر ژنەکەی خۆمم دانا. هەمووم بەهەدەر دا لەپێناو ئەوەی کە ژنەکەم لە هەولێرەوە بگاتە سوێد. ئەو کاتە، لە مالمۆ دەژیام.

– ئەمە کەی؟

– پازدە ساڵێک پێش ئەمڕۆ. ئێستەش هەر ماندوویی و هەلاکەتی ئەو ساڵە سەختانەم هەر لە گیان دەرنەچووە. بەکارکردن، بەقەرزوقۆڵ، بەمەئاساتێکی زۆرەوە.. هەر چۆنێک بێ توانیم لە ڕێگەی ئەستەمبۆڵەوە بیانگەیەنمە مالمۆ بۆ لای خۆم. سێ ساڵان بەردەوام ناو مێترۆ و ئاودەسخانە و گۆڕستانەکانی مالمۆم پاک کردەوە.. ئنجا دوای ئەوەش






چووم، وەک زندانکراوە موئەبیەدەکان، بلۆکم دەکێشایەوە، کرێکاریم دەکرد: بەس لەپێناو ئەوەی بتوانم لەژێر ئەو قەرزە زۆرە بێمە دەرەوە کە «تانیا خان» و دوو منداڵەکەمم پێ گەیاندبووە لای خۆم.

مامۆستا فەرەیدوون، نائارام، هەر دەمە و چاوی بۆ لایەک دەگێڕا. بەسەری پەنجەی شایەتمانی، دەیکوتیە بەردەم مێزەکە. چاوە پڕ فرمێسکەکانی کردە من:

– بۆچی لێم ناپرسی «ئەی پاشان» ؟

من بەهیچ شێوەیەک نەمدەزانی بتوانم دڵی ئەم پیاوە بریندارە بدەمەوە.. بەتایبەتیش لەبەرئەوەی کاتی خۆی مامۆستام بوو، شەرمم دەکرد لێی بپرسم:

– خۆی داوای لێت کرد تەڵاقی بدەیت؟

گوتی: نەء.

– ئەی؟

– پێش ئەوەی تەڵاقیشی بدەم، دەستی لەگەڵ «سوێدییەک» تێکەڵ کردبوو.

– ناخۆشیتان لەگەڵ یەکتر هەبوو؟

– من هەرگیز بێ دڵیی ئەوم نەدەکرد.

– لەگەڵ یەکتر نەدەگونجان؟!

– نازانم.

– ئەدی چی بوو؟

– ڕۆژێک لە ناکاو گوتی: «دەزانی فەرە گیان؛ ئەڵقەی زەواج دەتبەستێتەوە؟!».

گوتم: «چۆن؟ ».

گوتی: «ژیان لێرە لە دەرەوەی ئیلتیزاماتی زەواج و مێرد، خۆشترە».

گوتم: «ئاخر...

گوتی: «ئاخری پێ ناوێ..»، «ژنی کورد بەڕاستی کە دەگاتە ئەورووپا ئنجا لەوە تێ دەگات کە لە وڵاتی خۆی چ زوڵم و زۆرێکی لێ دەکرێت. کە



دەگاتە ئەورووپا ئنجا لەوە تێ دەگات کە ئەورووپا چ ماف و ئازادییەکی ڕەها و بێ سنووری بۆ ئافرەت دابین کردووە!».

فەرەیدوونی کۆنە مامۆستای کیمیام، غەمگین غەمگین، درێژەی بەقسەکانی خۆی دا و گوتی:

– من دەمزانی: دۆستە سوێدییەکەی، ئەندامی دەستەی باڵای ڕێکخراوێکی فەمینیستەکانی سوێد بوو. من ئەوپەڕی ئازادیم پێی بەخشیبوو: تەنانەت ئەگەر هاموشۆی ڕێکخراوی فەمینیستەکانیش بکات. دۆستە سوێدییەکەی خۆیشی هەر لەوێ دۆزیبۆوە.

مامۆستا فەرەیدوون، ئنجا قورگی پڕ لە گریانێکی زۆر کۆن، کەوتەوە هەڵڕشتنی سکاڵاکانی:

– تانیا دەشیزانی کە من جارێ هێشتا قەرزی ساڵانی ڕابردووم بەتەواوەتی نەداوەتەوە: ئەو قەرزە قورسانەی کە بۆ هێنانەدەرەوەی ئەوان، لە ماڵەکوردێک و لە ماڵە فەلەستینییەکی دراوسێمانم وەرگرتبوو.. کەچی ئەو زۆر بەجورئەت و ڕاستگۆیییەوە گوتی:

– دەمەوێ شتێکت پێ بڵێم.

– چییە؟

تانیا گوتی:

– حەز دەکەم لەمەودوا هەردووکمان ئەڵقەکانی پەنجەمان فڕێ بدەین.

– ئەی پاشان؟

– دوای تەڵاق؟

– بەڵێ؟

– دوای تەڵاق و جودابوونەوەمان بەسێ مانگ، مێردی بەسوێدییەکەی دۆستی خۆی کرد.

– ئەدی منداڵەکانتان؟

– دوو منداڵمان لە یەکتر هەبوو. سەما و سەمیان. جار بەجار دەچم دەیانبینم.

من سەیرێکی کاتژمێرم کرد، تەنیا چارەگە سەعاتێکم مابوو؛ دەبوایە






بگەمە وێستگە و سواری شەمەندەفەر بم: بەرەو لای جەودەتی هاورێم بەڕێ بکەوم. مامۆستا فەرەیدوون، پێش من، هەستایەوە سەر پێ و گوتی:

– دکتۆر فەرهاد؛ زۆر خۆشحاڵ بووم کە ئەم چەند دەقیقەیە لە ژنێف پێکەوە بووین..

هەستامەوە. بەشێوەیەک کە دڵی بدەمەوە و هیوای بەهێزبوونی ئیرادەی بۆ بخوازم، توند دەستیم گوشی:

– هیوای بەختەوەریت بۆ دەخوازم.

لە پێش دەرگای کافیتریاکە، پێی گوتم:

– تۆ ڕۆمان دەنووسیت.

گوتم: جار بەجار.

گوتی: بۆچی ئەم بەسەرهاتە ڕاستەقینەیەی من ناکەیتە ناوەڕۆکی ڕۆمانێکت؟

من لچک و لێوی پاڵتۆکەی خۆمم دەهێنایەوە بەریەک، گوتم:

– ئەگەر بشیکەمە چیرۆک، لە کوردستان کەس باوەڕم پێ ناکا..

– بۆچی؟

– دەڵێن «ئەورووپا ئەمە نییە کە د. فەرهاد باسی دەکا...».

لەپێش دەرگای کافیتریاکە، دووبارە، لەگەڵ مامۆستا فەرەیدوونی دەرسی کیمیا، باوەشمان بەیەکتردا کردەوە و توند توند دەستی یەکترمان گوشی:

– خوا حافیز..

کاتێ مامۆستا فەرەیدوونم بەجێ هێشت و بەتەواوەتی لێی دوور کەوتمەوە؛ لەناو شەمەندەفەرەکەمدا، سەرلەنوێ، دیمەنی مامۆستا فەرەیدوون دەهاتەوە پێش چاوم: شەپقەیەکی ڕەش و پاڵتۆیەکی ڕەش و پێڵاوێکی شینی پۆشیبوو؛ غەریب غەریب، خواحافیزیی لە ڕۆژانی ڕابردووی خۆی دەکرد.. پیاوێکی شەپقەڕەشی پاڵتۆڕەشی پێڵاو شین، بەسەر ئەم شەقامە ئاوارەیەی ئەورووپاوە، دەمدیت: هەنگاوەکانی، ئاوڕیان لە ڕابردوو دەدایەوە و هۆن هۆن دەگریان...